# بەشێک لە ئەنفالی گەرمیان

حەسەن بارام





کەرکوک
2007

لەبڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوك

٢١

# بەشێك لە ئەنفالی گەرمیان

حەسەن بارام

کەرکوك ٢٠٠٧

# پێڕست

## پێشکەشە

## بەباوکم و( ١٨٢٠٠٠ ) مرۆڤی کوردی ئەنفال کراو

# سەرەتایەك

بەشێک لە ئەنفالی گەرمیان، دەکۆمێنتێکی دیکەیە لە دەکۆمێنتەکانی کارەساتی ئەنفال، حەسەن بارام لە هەوڵێکی دانسقەو جواندا دەیەوێ بەشێک لە کارەساتی ئەنفالی سێ، وەک خۆی بێ زیادکردن بگێڕێتەوە، ئەم کتێبە بەکورتیو بەخێرایی گوزەرێکە بە تاریکترین قۆناغەکانی ئەنفالدا، ئەو لە ڕێگای ئەم کتێبەوە جگە لەوەی کە گوند بە گوند، ئەوەی بەردەستی کەوتبێ، ئاماری قوربانیانی ئەنفالمان دەخاتە بەردەست، جگەلەوە چەند چیرۆکێکیش لەو کەرەی ئەنفالە لە زاری ئەنفالدیدەکانەوە دەگێڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا حەسەن بارام، باسی لە چەند چالاکییەکی پێشمەرگەو جەماوەر دەکات، هەروەها لە بەشی سەرەتای کتێبەکەشدا دەیەوێ خوێنەر بەشاری خورماتو ئاشناو شارەزا بکات، کتێبخانەی ئەنفال، مەبەست لەهەموو ئەو کتێبانەیە کەبەوپەڕی ئاکارەوەو بێ هیچ نیازو مەرامێکی تایبەت نوسراون، بەم پێیەی حەسەن بارام دەوڵەمەندتر دەبێت، کارەساتی ئەنفال سەرەرای بەردەوامی قسەکردنی ئێمە لەبارەیەوە، هێشتا هیچی لەبارەوە نەگوتراوە، هێشتنەوەیئەم کارەساتە لە یادەوەری ئایندەدا هەر تەنیا پێویستی بەگێڕانەوەو حەکایەت نیە، بگرە پێویستی بە لەسەروەستانو هەڵوەستەکردنی ئەرێنییە، لەم کتێبە حەسەن بارام دێتە ڕیزی ئەو نوسەرانەوە کە دەکرێ بەپەنجەکانی دوو دەست تێنەپەڕن، بەڵام خەرمانێک زانیاری گرنگیان لە مردنو لەنێوچوون ڕزگارکردووە. ناونیشانی کتێبەکەی بارام بەشێکە لە لە ئەنفالی گەرمیان، بەو هیوایەی ئەم ناونیشانە ئاماژەو نیشانەی ئەوە بێت، کە نووسەر بەنیازی بەرهەمی دیکەش بێت لەو بارەیەوە، بەبڕوای من ئەم کتێبە

هۆکارێکە بۆ ئەوەی کە دەستخۆشی لە نوسەرو ئامادەکارەکەی بکەم، بۆیەش لەپاڵ نوسەرەوە ئامادەکاریشم زیاد کرد، لەبەر ئەوەی جگە لەناوی قوربانیەکان کۆی دیدارەکان دەچنە چوارچێوەی چاوپێکەوتن‌و ئامادەکردنەوە، مکە ئەمەان هەرگیز بە نوسین حساب ناکرێت، وەک ئەوەی نوسینێک بۆ نوسەرەکەی حساب دەکرێ، تەواوی کتێبەکە یەک راستی بەئێمە دەڵێ ئەویش ئەوەیە کە ئەم ناوچەیە، واتە گەرمیان هەمیشە جێگای کارەسات‌و رووبەڕووبونەوەو ماوە بووە، دوبارە دەستخۆشی لە حەسەن بارام‌و کۆی ئەوانەش کەبێ پاداشت بۆ ئەنفال دەنووسن.

لەتیف فاتح فەرەج

# پەیامێک

دەبێت هەموو کورد بزانێت ئەنفال تەنها زادەی بیری بەعس و سەدام نییە , بەڵکو بەرهەمی ئەو کلتورەیە , کە سەدان ساڵە ئەنفالی ئەم و ئەو دەکات لە ژێر ناوو بیانووی جیاجیادا , ئێستاش کە تاونباران دادگایی دەکرێن , ئەوا دەبێت ئەو راستیە بزانین کە تەنها سەدام لە ئاستی مەرگەساتی ئەنفالدا تاوانبار نیە , بەڵکو مێژوو کلتورو عەقڵیەتی نەتەوەی سەردەستیش تاوانبارە، چونکە ئەنفالکردن شتێکی تازەنییە . وەلێ لە ساڵی (٢)ی کۆچی بەدواوە سەرکردەو پادشاو حوکمڕانانی عەرەب لە ژێر ناوو بیانووی جۆراو جۆردا بەشێوەیەکی نادورست و شێواوەوە ئەنفالیان کردۆتە پەیامێک و شەرعییەتیان پێی داوە , بۆیە سوپایەکی زیاتر لە یەک ملیۆنی و سەدان هەزار جەلادی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعس و هەمو ئەوانەش کەچەندین ساڵە چەپڵە بۆ تاوانەکانی دیکتاتۆر لێدەدەن , لەبەرامبەر کردەو تراژیدیای ئەنفالدا تاوانبارن , بۆیە دەبێت بەشێوەیەک لە شێوەکان بدرێنە دادگا , بۆیە کاتی ئەوە هاتووە بەناوی نەتەوەی سەردەستەوە لێبوردن نامەیەک ئاراستەی گەلی کورد بکرێت لە باشووری کوردستان , لەبەرامبەر ئەو هەموو تاوان و کارەساتانەی کە بەسەر گەلی کوردا هێناویانە..

## پێشەکی

ئیشکردن و لێتوێژینەوە لەسەر رەهەندە جیاجیاکانی پرۆسەی ئەنفال , تاهەنووکە نەچۆتە ئەندازەی ئاستی قورسایی پرۆسەکەوە . مێژووی دوورو درێژی ئەنفال , فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی ئەنفال , قۆناغەکانی ئەنفال , شێوازەکانی ئەنفال , داهێنەران و هەڵگرانی پەیامی ئەنفال , ئامانج و مەبەستەکان لە ئەنفال ... هتد

هەموو ئەمانە کاری ئاسان نین و پێویستدەکات خەڵکانی پسپۆرو شارەزاخۆیان بۆ لێکۆڵینەوەو راڤەکردنی لایەنە جیاجیاکانی تەرخان بکەن، چونکە سەدان ساڵە هەڵگرانی ئەم پەیامە چ لە ژینگەی خۆیانداو چ لەسەر خاك و نیشتمانی گەلانی تری ناوچەکە ئیشی لەسەر دەکەن , چەندین جارە و لەژێر ناوو بیانووی جیاجیادا ئەنفالیان برپوەتە بەری گەلانی ژێر دەست و چەوساوەی دەورو بەریان.

سەبارەت بە ئێمەی کوردیش بەناوی ئەنفالەوە برینێکی سەختیان لەسەر جەستەی شەکەت و ماندوومان هەڵکەند , کەپێناچێت بەم دەورو زەمانە سارێژ بێت.. تراژیدیای ئەنفال مەسەلەیەك نییە بەم زووانە کاریگەریە هەمە چەشنەکانی بڕەوێتەوە چونکە مێژووی مرۆڤایەتی و بەتایبەتیش مێژووی هاوچەرخ کارەساتی لەم جۆرە بەو فۆرم و شێوازەوە بەدەگمەن بەخۆوە نەبینیوە . وەلێ ئەگەر ویژدانی مرۆڤایەتی و دەوڵەتانی دونیا ئەم کارەساتە وەك چۆن لەسەرەتاوە نقەیان لێوە نەهات , ئێستاش لەبیری بکەن , ئەوا دەبێت میللەتی کورد نەوە لەدوای نەوە ئەم تراژیدیایە لە یاد نەکەن هەقە هەمیشە وەکو سیمبولی مەزلومێتی ئەم نەتەوەیە تەماشابکرێت

بەهەرحاڵ قسەکردن یان نووسین و لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلەیەکی فرە ڕەهەندی وەک شاڵاوی ئەنفال, ڕەنگە کارێکی ئاسان و بێزەحمەت نەبێت, هەرئەم ڕاستیەش وای لێکردم سەرەتا نەچمە ژێر بارێکی گەورەو قورسەوە, کەدواجار بارنەکرێت. چونکە لێتوێژینەوەو خوێندنەوەی لایەنە جیاجیاکانی ئەم کارەساتە پێویستی بەکات و سەرچاوەی هێجگار زۆر هەیە, کەپێم وایە لەم قۆناغەدا بەمن هەڵنەسورێت جالەو ڕەهەندەوە بڕیارمدا بۆ ئەم کورتە نووسینە تەنها ئەنفالی سێ و لەناو ئەم قۆناغەشدا تەنها سنووری قەزای خورماتوو بکەم بەمەبەست بۆ ئەم نووسینە کەخۆی لە سنووری هەردوو ناحیەی (قادرکەرەم و نەوجول)دا دەبینێتەوە، لەبەرئەوەی ئەم سنوورە زیان و کارەساتەکان تێیدا بێ شوومارن, بۆیە لەو ڕوانگەیەوە ویستم وەک ئەرک و خزمەتێک ئەوەندەی بکرێت شتێک لەسەر ئەم بابەتە پڕلەژانەی کەپێم وایە هەمیشە لەنێو پاشماوەکانی ئەم کارەساتەدا دووبارە دەبێتەوە بنووسمەوە, چونکە وەک تاکێکی نێو کۆمەڵگای کوردەواری زامەکانی ئەنفال بەسەر جەستەمەوە بەبەردەوامی دەکولێتەوە . دڵنیام بەم نووسینە ناتوانم مافی تەواوی ئەو مەسەلەیە بدەم و ڕەنگە بابەتەکەش بێ کەم و کوڕی نەبێت . ئومێد دەکەم توانیبێتم خزمەتێکی بچووکم کردبێت بەو ئاراستەیەدا .

# خورماتوو

خورماتوو وەک یەکێ لە قەزا گەورەکانی کوردستان پێگەیەکەی جیۆسیاسی گرنگ شک دەبات و هەمیشە لەسەردەمە جیاجیاکاندا جێگای بایەخ و مشت و مڕ بووە .

ئەم قەزایە چ بۆ کوردستانی گەورە و چ بۆ باشووری کوردستانیش بەدوا سنوور دێتە ئەژماردن لەگەڵ بەشە عەرەبەکەی عێراقدا . بەنزیکەی ( ٧٥کم) دەکەوێتە باشووری پارێزگای کەرکوک و وە بە (٤٥کم)یش دەکەوێتە خۆرئاوای شاری کفریەوە . لە رووی هەڵکەوتەی جوگرافیەوە دەکەوێتە دامێنی زنجیرە شاخی هەنجیرەوە , بەنزیکەی (٣٥کم) دەکەوێتە خۆرهەلاتی زنجیرە چیای حەمرین , لەسەر رێگای گشتی کوردستان – بەغداد , ئەم شارە بەدەروازەی کوردستان لەقەڵەم دەدرێت . چونکە باشووری کوردستان بەبەشە عەرەبەکەی عێراقەوە دەبەستێتەوە .

گرنگییەکە تری ئەم بازێرە لەوەدایە لە رووی سەرچاوەی ئاوی و کشتوکاڵیەوە ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەتە , چۆمی ئاوەسپی لای باشوورەوە بەتەنیشت شارەکەدا تێپەر دەبێت, لای باکوری خۆرئاوایشەوە پرۆژەیەکی ئاودێری گرنگ تێپەردەبێت .

ئەم قەزایە بەشێکی فراوانە لە پانتایی دەڤەری گەرمیان, لە رووی رووبەرەوە بەر لەوەی بلکێندرێت بە پارێزگای ( صلاح الدین )ەوە , لە ( ٣٤٪ ) ی رووبەری پارێزگای کەرکوکی پێک دەهێنا , لەرووی چری دانیشتوانیشەوە بەپێی سەر ژمێری ساڵی (١٩٥٧) ژمارەی دانیشتوانی ئەم قەزایە نزیکەی ( ١/٤ )ی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوکی پێک دەهێنا. پێش پرۆسەی بەدناوی

ئـــەنفال, زۆربـــەی هــەرە زۆری دانیــشتوانی سنــووری ئــەم قـــەزایە کـــوردبوون, ژمـارەیـــک عـــەرەب و تـورکمانیـــش لـــە ناوەنـــدو بـــاشوری شـــارەکە نیـــشتەجێ بـووبـــوون, بـــەڵام بـەشێـــکی زۆری دانـیـــشتوانی هــــەردوو نــاحیــــەی قـــادر کــــەرم و نــەوجـــول لـەپـەلامارەکانی ئـەنفالـدا بێســەرو شوێــن کـران کە لـەسەدا سەد کــورد بــوون . ڕژێـــمی بەعـس لــە (٣٥)ساڵی رابـردوودا دەستکـاری زۆری لــــەیەکە ئیـدارییــــەکانی سنـــورەکـــەدا ئـەنجامـــداوە , بـەمەبەســتی گۆریـــن و شێــواندنــی رەسـەنایــەتی کــورد بـــوونی شارەکە . وەلێ بــەپێی ئــاماری ســاڵی (١٩٩٧) رێـــژەی دانیــشتوانی ئەم قــەزایە نـزیکەی (١٣٠)هــەزار کـەس بووە .

ئـــەم نـاوچـەیە لـەڕووی بـــوونی نـــەوت و کــانزای جـــۆراو جـــۆرەوە گەلــێک دەوڵـــەمەندە, بــۆ نموونە برێــکی بـــاش لـەنەوت و گـــۆگرد و غـــاز و خوێ لـــە خـۆرهەڵاتـــی شـارەکەو نـــاوچـــەی (بناری گل) شک دەبـــرێــــــت , لـــــە رووی ســـــامانی سـروشتیـــەوە بەناوچـــەیەکی دەوڵـــەمەند دەژمێـردرێـت , هـەرچـەندە تـاکو ئێستـاش لێی بـەکار نەهاتووە وەکــو یەدەک مـــاوەتەوە . دەربـارەی مێژووی پــەیدا بـــوونی ئــــەم شـــارەیش گەلێـــک ســـەرچاوەی کـــۆن و نــوێ ئــاماژەیـــان بــۆکـــردووە, بـە تایبـەتی ســـەرچاوە مێژوویەکانی ئـــاشووری و ئەکەدی و ئیــلامی. بەشێــکی ئەو ســەرچاوانەش مێــژووی دروســت بــوونی ئەم شــارە دەگەرێـنـەوە بۆ سەردەمی ( خۆرییـــەکان ). هــەروەهــا چـەندین ســەرچاوەی خـــۆماڵی و بیانی بــە شێـــوەی جـیا جیا بـــاسیـان لــە مێژووی رەگ و ریشەی نـــاوی شـــارەکە کـــردووە, کـــە درئەنـــجام چەندیـــن

بیرو بۆچوونی لە یەکتر جودای لێ بەر هەم هاتووە , کە مەرج نیە هەموو ئەو لێکۆڵینەوانە راست و دروست بن, هەندێکی بە شێوەی زانستی نەنووسراون بەشێکیشیان بەمەبەستی شێواندنی راستیەکان تۆمارکراون. جا بۆ ئاشنا بوون بە مێژوو رەگ و ریشەی ناوی ئەم بازێرە, مەرج نیە پشت بە هەموو ئەو نووسراوو لێکۆڵینەوانە ببەسترێت

سە بارەت بە بنەچەی ناوی شارە کە ش تا هەنوکە بەچەندین ناوی جۆراوجۆری وەک ( خرمتی , خورماتوو , دووزخورماتو , توزخورماتو , دووز , گوز , گوزحورماتوو .. هتد) ناسراوە , دە ربارەی مانای هەر یەک لەو زاراوانەش میژوونووسان خویندنەوەی جیا جیایان بۆ کردووە بۆ دەرخستنی راستی و دروستی مانا و بنەچەی وشەکە \ تاکو ئیستاش بەبۆچوونی بەندە باشترین بیرورا سەبارەت بە میژووی دروستبوونی شارە کە و هە روهاش ناوەکەی بیروڕاکانی مێژوونوسی گەورەی (دکتۆر کەماڵ موزهەر) کە بەم شێوەیەیە :

*ئەم شارە پێش زاین لە لایان خۆریە کانەوە دروست کراوە .

*ناوی ڕەسەنی شارەکە (خورماتوو) . ئەم وشەیە لە دوو بڕگە پێکهاتووە ، (خۆر) بە واتای خۆریە کان و(ماتوو)یش بە مانای شار دێت لە زمانی ئەکەدیدا ، کە واتا هەردوو وشەکە پێکەوەبە مانای اشاری خۆریەکان ) دێت . ئەمەو تاکو سەدەی نۆزدە و تەنانەت سەدەی بیستەمیش هەر وشەی (خورماتوو ) بۆ ناو هێنانی ئەم شارە بەکارهاتووە .

# خورماتوو پێش ئەنفال

شـــارۆچکەی خـــورماتوو لــە ســاڵی (١٩٥١) بەفـــەرمی کـــرایە نـــاوەندی قـــــەزا , پـــانتایی بـــەشێکی فـــراوانی سنـــووری پـــارێزگای کــەرکوکی پێکـــدەهێنا . بـــەپێی ئـــــاماری ســــاڵی (١٩٥٧) بـــــەشی هــــەرە زۆری دانیشتوانـەکەی بریتی بـووە لـە کـورد و ژمارەیەک عـەرەب و تورکمان لـە ناوەند و باشووری شارەکە نیشتەجێبوون .

لــەکۆتایی شــەســتەکان و ســەرەتــای هـــەفتاکانی ســـەدەی بیستەمدا, بـەهۆی گەشەسـەندنی رێـــژەی دانیـشتوان لـە دەڤەرەکـــەدا, ژمـــارەی ناحیـەکانی زیـادکرا , کـــە پـێش ئـەنفال بریتیـی بـــوون لــە ناحیـەکانی (قـادرکەرەم , نـەوجول ,سلێمان بەگ, ئامرلی ) .

دابەشبوونی پێکهاتەکانی نێو قەزاکە لە رووی جوگرافیەوە :

- نـــاوەندی قـــەزاکە بەشـی هـــــەرە زۆری دانیشـتوانەکەی کـــوردن و بەپلە دوو تورکمان دێت لەگەڵ ژمارەیەک کەمی عەرەبدا .
- لای خـــۆرهەڵات و باکورەوە هەردوو ناحیـــەی (نەوجول و قادرکـەرەم ) دێت کە لە ســەداسەد دانیشتوانەکــەی کـــوردبوون و بـــەشی هــەرە زۆری سنووری قەزاکە پێک دێنێت .
- لای خـــۆرئـــاواوە بـــــەشێکی زۆری کــــوردی تـــێدا نیـشـتەجێبویوو لـەگـەڵ چەند گوندێکی عەرەبنشیندا .
- لای بـاشـووریشەوە هــەردوو ناحیـــەی سلێمان بـەگ و ئـامرلی دێت کە بریتین لە عەرەب و تورکمان .

بەهەر حاڵ سنووری قەزاکە تا دەهات لە گەشەسەندنی زاتی خۆیدا بوو, زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان و بەرفراوانی و دەوڵەمەندی ناوچەکە لە ڕووی سامانی سروشتیەوە لەلایەک , بەشداریکردنی خەڵکی ناوچەکە لە شۆڕشی چەکداری و ملنەدان بۆ سیاسەت و داخوازیکانی ڕژێم و بەگژا چوونەوەی داموودەزگاکانی بەعس لەلایەکی ترەوە , وای لە دەسەڵاتدارانی بەغدا کردبوو کە هەمیشەیی بەچاوی گومان و ترسەوە بروانن ناوچەکەو بەمەترسی لەقەڵەم بدەن بۆسەر بەرژەوەندیەکانی بەعس . بۆیە لە ژێر بیانووی ڕەواندنەوەو کەمکردنەوەی مەترسیە ئەمنی و سەربازیەکان بۆسەر بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی عەرەب و عێراق . ڕژێم دەستی دایە پەیرەوکردنی کۆمەڵێک سیاسەت و ڕەفتاری شۆفێنی لە دژی کورد , کە ئامانج تێیدا کەمکردنەوەی ڕێژەی دانیشتوانی کورد و لە قاڵبدانی سنووری جوگرافیای قەزاکە بوو , بەقەزانجی ئامانجەکانی بەعس و نەتەوەی سەردەستدا . ئەم سیاسەت و بڕیارانەی لای خوارەوەش بەشێکن لە بەرنامەو پیلانەکانی بەعس کە بەچەندین ساڵ پێش پرۆسەی ئەنفال لە سنووری قەزاکەدا کەوتبووە کار کە خۆی لە پەیرەوکردنی سیاسەتەکانی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و تەبعیس و ڕاستکردنەوەی نەتەوەیی و پرۆسەی وێرانکردنی شارو لادێ و ئابڵوقەی ئابوری و پەلاماری سەربازی بۆسەر ناوچە . .

بەعەرەبکردن / بەکورتی ڕژێمی بەعس بەچەندین ساڵ بەر لە پەلاماری ئەنفال بۆسەر کوردستان و ناوچەکە , بەئاراستەی

بەعەرەبکردنی سنووری قەزاکە چەندین هەنگاوی شۆفێنی هاوێشت وەک:

- بەپێی بریاری فەرمی ژمارە (41)ی کۆماری لەساڵی ١٩٧٦ لە هەنگاوێکی ترسناک و دوژمنکارانەدا , قەزای خورماتووی بەتەواوەتی لە پارێزگای کەرکوک دابراند و لکاندی بەپارێزگای ( صلاح الدين / تكريت )وە .
- دروستکردنی چەندین نشینگە ( مستەوتەنات ) لە ساڵی ١٩٧٧ لە خۆرئاواو باشووری شارەکە و هەروەها نیشتەجێکردنی سەدان خێزانی عەرەبی هاوردە تێیدا.
- یاساغکردنی خوێندن بەزمانی کوردی و داخستنی قوتابخانە کوردیەکانی شارەکە .
- دابەشکردنی زەوی و زاری جوتیارانی کورد بەسەر عەرەبی هاوردەدا بەتایبەتی لە باکور و خۆرئاوای شارەکە .

ئەمەی سەرەوە بەشێک بوون لە سیاسەتەکانی بەعس لە چوارچێوەی شاڵاوی بەعەرەبکردن لە سنوورەکەدا تاکو پێش کردەی بەدناوی ئەنفال .

ڕاگواستن / بەمەبەستی زیاتر کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد لەو دەڤەرە , رژێم پەنای بردە بەر سیاسەتی راگواستنی هاوڵاتیانی کورد لە ناوەندو دەوروبەری قەزاکە وەک راگواستنی دەیان خێزانی کورد دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ی شۆرشی ئەیلول بۆ شارەکانی خوارووی عێراق

- پـاش هەڵایـسانی شۆڕشـی نـوێی گـەلەکەمان و بـەتـایبەتی لـە هەشتاکان بەدواوە , بـەهۆی بەشداریکردنی کـورو کـەس و کـاریـان لــە شـۆڕشی نـوێدا , چـەندین خێـزان لـە ناوەنـدی شـارەکە راپێـچی سنوورەکانی ئێران کران .

- بـەپێی نووسـراوی ژمارە (٣٩٠) بەرواری ١٩٨٧/٤/٦ پارێزگـای سەلاحەدین بریـاری رۆخـاندن و چـۆڵکردنی گـوندەکانـی (پـارەپارە , ئەلبوسـەباح , تەپەسەوز ادراو هەروەها کۆکردنـەوەیان لەئۆردوگای زۆرەملێی سەیاد لە باشووری شارەکە .

- بـەپێی نووسراوی ژمـارە (٥٤٦)ی بـەرواری ١٩٨٧/٦/٩ قـایمقامـیەتی قەزاکە پـارێزگای سـەلاحەدین لـەوە ئاگادار دەکـاتـەوە , کـە تـا ئـەو بـەرواره زیـاتر لـە (٢٣)گـوندی سـنوورەکە لەلایـەن سـوپاوە وێـران کراوەو دانیشتوانەکەی چۆڵیان کردووە .

جگـە لـەم سیاسـەتانەش دامـودەزگا داپڵۆسـێنەرەکانی بـەعس لـەو دەڤـەرە کاریـان لەسـەر سیاسـەتی ئـاگرو ئاسـن دەکـرد لـە دژی کـورد , کەلە ئاکامدا بەسەدان هاوڵاتی و خـێزانی کورد بـوونە قوربانی مـەرام و رەفتارەکانی کاربەدەستانی ئەو رژێمە .

سـەبارەت بەدانیشتوانی گـوندەکانی سـەر بـە هـەردوو ناحیەی قـادر کـەرەم و نـەوجول تادەهـات گوشـار و ئابڵوقـەی هەمـەجۆر بۆسـەریان زیـادی دەکـرد , تاکـار گـەیشتە ئـەوەی هـاتوچۆی شـارو لادێکـان قـەدەغە بکرێت و دواجار بریاری یـاساغکردنی ژیان و هـاتووچۆ درا لە هـەموو ئەو سنورانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی هێـزی پێشمەرگـەدابوو .

سـەرباری پەیرەوکـردنی ئـەم سـیاسەتە توندانـەی کـاربەدەستانی

رژێـم ، هێـرش و پەلامارەکانی جـاش و سوپا بۆسەر گوندنشینان زیاتـــر دەبوو ، کە دەرئەنـجام بەدەیــان گــوند ســوتێنران و بــەسەدان هاوڵاتی بــێ گـــــوناهیش بوونــە قوربــانی . جیـا لــەوەش رۆژانـــــە بـــۆردومانی کوێرانەی فرۆکەو تۆپبارانی قورسی گوندەکان دەکرا .

بــۆیە تـا دەهـات گوشـــارو هێرشــەکانی جاش و جـەیش بۆسـەر ناوچـە ئازادکراوەکـانی ژێـــر دەســـەڵاتی پێـشمەرگە روو لـە زیــــادبوون بـوو ، هــــەر ئەمـــەش وای کـــردبوو بـەتـــــەواوەتی ژیــــــان و گـــــوزەرانی گـوندنشینانی ناوچەکە بکەوێتە بەر مەترسی لـــەناوچوون ، کـــە دواجـــار بەپـــرۆسەی قرکردن و بەسوتماککردنی کوردستان لـە کـــردەی ئەنفالـــدا گەیشـــتە تــــرۆپک لــــە ســـنووری قــەزای خورماتوودا .

# نەوجول پێش ئەنفال

نــەوجول ســـەرەتا دێــیەک بـــووە لــە چــە قــی ناوچــەی (داوێ ) . پاشـان بـەبڕیـــارێک لـــە ســـاڵی (١٩٧٤) کـــراوە بـەنـــاحیە, بـــەنزیکەی (٣٠) کیلۆمەتردەکـەوێتــە ســـەرووی ڕۆژهــەڵاتی شــارۆچکەی خورمـاتووە , لـە ڕۆژهەڵاتیـەوە پێـــدەشتی گەرمیانـە , کـەرکوکیش دەکـــەوێتە بـــاکوری ڕۆژئـــاوایەوە , لای خـــوارەوەش خورمـاتووە , بـە لای سەرەوەشـدا (جـە وەڵـی گـل )ە . پـێش ئـەنفال نزیکـــەی (٢٠٠) مـــاڵ بـــووە، سـەبـارەت بـەڕەگ و ڕیشەی نـاوی نــەوجول چـەندین بـیرورا هەیە

کەبەهێزترینیان ئەوەیـە کەدەڵێت ( ناوی نەوجول لەنۆجیل یان نۆ خێڵەوە هاتـووە )، ئەم ناحیەیە پێش خاپورکـــردنی قــوتابخانەیەکی ســـەرەتـایی و نـــاوەندی کــچان و کـــوڕان هــەروەها نەخۆشـخانەیەکی تێـدا بـوو، ئـــەم شـــارۆچکەیە چەندیـــن جـــار لــەلایـــەن ســـوپای عێراقــەوە وێرانکـراوە , ســەرباری ئــەوەی لــە ساڵی ١٩٨٥ تاکــو دەســتپێکردنی کــردەی ئـەنفال بــەبەردەوامی گـــوندەکانی ئـەو ســنوورەی ژێـــر دەســەڵاتی پێـشمەرگە دەکەوتنـە بـــەر هێـرش و پەلاماری سوپاو جـاشەوە . جیا لـەوەش ڕۆژانـە زۆربەی گونـدەکان تــۆپباران و بــۆردومــان دەکــران , دەرئەنـجام بــەدەر لە زیانی مـاددی بەدەیان هــاوڵاتی سڤیلْ دەبــوونــە قــوربـانی . لـەگـــەڵ زیـــادبـــــوونی گـوشـــــارە جۆراوجۆرەکـــانی رژێـــم و هـــەرەشـــــەو پــەلامــــارەکانی سـوپا بــۆ ســـەر ناوچــەکە، تـــا دەهـــات پانتـایی ژیـــان بـەرتەسـک دەبووەوە , تـا کـار گەیشـــتە ئـەوەی لـە شـــاڵاوی ئەنفالــدا چ نـاوەنـــدی نـــاحیەکەو چ گوندەکـــانی ســـەر بـەو ناحیەیـە بەتـــەواوەتی

لەلایەن سوپاو جاشەوە خاپور کران و بەشێکی زۆری دانیشتوانەکەی بـزرو بێ سەرو شوێن کـران , ئەوەش کـە لـەو پرۆسـەیە رزگـاری بـوو راپێـچی ئۆردوگا زۆرەملـێەکان کـران .

* ناوی گوندەکانی سنووری ناحیەی نەوجول :

شـۆراو / قـەلا / مـەحمود بـەگ / قـوم پـەڵک / نـامیق / عـەرەب ئاغـا / چـەوری / سـاڵەیی / ئۆمەرسـۆفی / حـەیدەرە سـوور / بـاش تەپـە / گـومەتەبۆر / پـەڵکانەی سـەیدەکان / پـەڵکانەی کوردی / گـۆمەیی / لـەک / قـوشەلان / گـەرمک / وارانـی ژوورو/ وارانـی خـواروو / دوراجـی / لفـتی ئـاغا / تالاو / زنـاەی گەورە / زنانەی بچـووک/ چەچان / میل ناسر / چاڵەو دوانە / قـەڵخانلووی گەورە / قەڵخانلووی بچووک ... هتد

* نەوجول لە ئاماری ساڵی ١٩٧٧

# ناحیەی قادر کەرەم پێش ئەنفال

قـــادرکەرەم بـــەدووری ( ٥٠ )میـل دەکەوێتـە خـواروی رۆژهـەلاتی شـاری کـەرکوک , بەتەنیـشتیدا چـۆمی رۆخانـە تێپـەردەبێت . سـەبارەت بـە سـنووری جـوگـرافیای نـاوچەکە, لای بـاکورەوە سـنووری قـەزای چەمچەماڵە لای باکوری رۆژهەلاتـەوە نـاحیەی سەنگاوە, لای رۆژهەلاتـەوە ناحیەی بێبازە, لای باشووری رۆژهەلاتـەوە سـنووری قـەزای کـەلارە, لای باشووریـشەوە نـاحیەی نەوجـولە, تـەواوی رووبـەری نـاحیەی قـادرکەرەم ( ٧,٥٪ ) لـە رووبـەری پارێزگـای کـەرکوک پێـک دەهێنـی . قـادرکـەرەم سـەرەتـا دێ بـووەو لـە سـاڵی (١٨٦٦) دروسـتکراوە .

دەربارەی بنـەرەتی نـاوی قـادرکـەرەم چـەندین بـیرورا هـەن وەک :

بـیرورای یەکـەم/ بـاس لەوە دەکرێـت دووبـرا هـەبوونە بەناوی قادر و کـەرەم , کـە لـەو شـوێنە نیـشتەجێبوون , بـەپێی هەنـدێک لـە سەرچاوەکان گوایە ئەو دێیە لـەلایەن ئـەو دووبـرایەوە ئـاوەدانکراوەتەوە , ئیدی هەر بەناوی ئەو دووبرایەوە ناوبانگی دەرکردووە .

بیرورای دووەم/ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوایە ئەم دێیە لەسەر دەستی حـەزرەتی شـێخ حـەسـەنی قـەرەچێوار دروسـت کـراوە بـەناوی قادرکەرەمەوە , لێکدانـەوەی پـیری قـەرەچێوار بـۆ ئـەم نـاوە ئـەوەیە گوایە جێگای کەرەمی شێخ عبدول قادری گەیلانیە ،

لە سـاڵی ١٩٣١ دوای شـەری ئـاوباریک بـەهۆی هاوکاری و بەشداریکردنی خـەڵکی ناوچـەکە لەگـەڵ شێخ مـەحمودی نـەمردا , دەسەلاتدارانی ئـەوجا ناوەنـدی قەزاکـەیان گـواستەوە بـۆ نـاوەندی ناحیـەی داقـوق . رژێمـی بـەعس هـەر لـە سـەرەتای گرتنـە دەسـتی دەسـەلات بـەهۆی گـرنگی

هەڵكەوتەی ناحیەكەوە گوشارەكانی بۆ سەر سنورەكە زیاتر كردبوو , بەبەردەوامیش پەلاماری گوندەكانی سنوورەكەی دەدا لە هەشتاكان بەدواوە لە چوار چێوەی ئەو بەرنامەدا چەندین گوند وێرانكران لە ناوچەكانی زەنگەنەو بناری گڵ و شێخان و جەباری وەك گوندەكانی ( جان وەیس بەگ , ئالی خان بەگ , فەرهاد بەگ , چەم سور خاوو ... هتد ) . بەر لە پەلاماری ئەنفال ووردە ووردە هاتوچۆی نێوان شارو لادێكانی سنوورەكە قەدەغەكرا , سوپاو جاش بەچەندین شێوە هەڵیان دەكوتایە سەر ئەو گوندانەی كە لە رێگاو بانە سەرەكیەكان نزیك بوون یان هاوسنور بوون لەگەڵ مۆڵگا سەربازیەكاندا . سیاسەت و رەفتارە شۆفێنیەكانی رژێمی بەغدا لە پەلاماری ئەنفالدا بۆسەر ناوچەكە سەرئەنجام گەیشتە ترۆپك و تەرو وشك پێكەوە سوتێنران .

* گوندەكانی سنووری ناحیەی قادركەرەم پێش ئەنفال :-

عبداللە هۆری / عبداللە هۆری تازە / گوڵباخی گەورە / گوڵباخی بچووك / قیرچە/ مشكی بان / هەرێنە / هەر مۆڵە / تۆپ خانە / قەشقە / قەیتول / گەراوی / خدر رەیحان / ئیبراهیم غولام / بنەكە / تیلەكۆی زەنگەنە / سپی سەر / مەلا ئۆمەر / فەقێ مستەفا / بەكرە گەرە / تاوسانەی كەرەم / حەسەن پرچن / كانی قادر قەڵا/ كانی قادر ژوورو / كانی قادر خواروو / سۆفی رەزا / عەزیز بەگ / ئاوباریك / كۆشكی سەروو / كۆشكی خواروو / كۆشكی ناوەراست / دارتووی گڵ / بارام بەگ/ تازە شار / فەرهاد بەگ / جان وەیس بەگ / ئالی خان بەگ / تەختەمینەی گەورە/ تەختەمینەی

بچووک / رەمەزان مامکە / باوەکر / کەریم باسام / لک قادر سەرهەتگ / مام میسک / تەڵەبی / دارتوو / لەک هیدایەت / شاوک / قەڵا میکائیل سەروو / قەڵا میکائیل خواروو / بەگ زادە / ئاودێر / بان گۆڵ / قوچەلی / شێخ مەحمەد / سۆران / گۆران / حەمک / حەسەن خان / پوزەڵ / هەنارەی خواروو / هەنارەی سەروو / کوڵەبان / قەرەچێوار / جانی / کەپە کورە / تەکیە / قایتەوەنی عومەر / قایتەوەنی ئەوبەر / بەکر باجەلان / چنگی / وەستا خدر / وێڵە / عەلی مستەفا / ئالیاوا / چەم سوور خاو / ژاژ / داروەسەرە / پارویڵە / تاوێرەبەرزە / چیمەنی حاجی ئەمین / زەردە / موحمود پەریزە / گۆلەمە ...هتد

* * *

## ئەنفال پرۆسەیەك
## بۆ سڕینەوەی نەتەوەیەك

رەنگــە وشــەی ئــەنفال لە نــێو كــۆمــەڵگای كــوردەواریــدا , تاكو ساڵی هــەشتاو هــەشــت كەمــترین وشــە بێـت كـە كـورد پێـی ئاشنا بێـت یـان بەكاری هێنا بێـت , ئــەمەش ئــەوە ناگەیــەنێت كـورد بـەر لـە پەلاماری ساڵی هەشتاو هەشت , ئـەنفـال نـەكـرابێت و بـەر پـەلامـار و شالاّوی كوشـتن و بـرین و تـالان و بـڕۆ نـەكـەوتـووبێت لەلایــەن داگیركــەرانی كوردستانەوە .

ئـــەنفال لـەو رۆژگـارەی كـە بـۆ مـەبـەستێكی تــرو لـە نــێو دوركـەی عەرەبیــدا وەك پــەیـامــێك بــۆ چارەســەركــردنی دۆزێــك لەنــێو موســوولّماناندا لــە دایـك دەبێــت , ئــیدی لــەویّ رۆژیّ بـــەدواوە بـەئـاوەژۆوە دەبێــتە روخسـەت و شـەرعیەتـی پـیّ دەدرێـت لـەلایـەن سـەرانـی عـەرەبـەوە بـۆ مـەبـەستی نارەواو نـادروسـت .

بـەكارهێــنانی وشـــەی ئــەنفال لەلایــەن دەسـەلاّتــدارانی عەرەبــەوە لەسـەردەمە جیاجیاكـان و تـەنانــەت بـەئێستاشەوە بـوّتـە بـاو عـورفـێكی نێو عـەقڵیەت و كلـتوری ئـەو نـەتـەوەیە , مــەرجیش نیـە هـەمـوو ئەو تـالاّن و كارەسـاتە خـوێناویــانەی رابــردوو دەقـاو دەق لـە رووكـەشــدا هـەڵگـری هـەمان ناو بێـت , بـەڵام لەناوەرۆكـدا گوزارشـت لەهـەمان وشـەو پرۆسـە دەكـات . ئـــەنفال وشـەیــەكی رووت عــەرەبیــە , لـــە رووی راڤــەكاریشـەوە ئــەم وشــەیە لـە نـێو زوبـان و فـەرهـەنگی عـەرەبیــدا خاوەن چەندین ماناو واتای جیـاوازە , جیا لـەمـەش ئـەنفال نـاوی سورەتی هەشتەمە لە قورئانی پیرۆزدا , هـۆی دابـەزینـەكـەشی دەگـەڕێتەوە بـۆ

شەری بەدر لە ساڵی (٢)ی کۆچیدا . کاتێک ئەو شەرە بەقازانجی موسوڵمانەکان و دۆڕانی قوڕیشیەکان کۆتایی دێت , بەرەی موسوڵمانان لەسەر دەسکەوتەکانی ئەو جەنگە دەبنە دوو کەرتەوە سەبارەت بەحەڵاڵی و حەرامی دەسکەوتەکان و چۆنێتی دابەشکردنی لە نێوانیاندا , بۆیە حاڵەتی گومان و پرسیار دروست دەبێت دەرئەنجام خوای گەورە بەم ئایەتە وڵامیان دەداتەوە :( قل الانفال لله والرسول... ) . بەمەش تا ئەندازەیەکی کەم ئەو گرێ کوێرەیەی نێوانیان شل دەبێتەوە , وەلێ لێرەوە تەنگەژەیەکی دیکە لەهەمان چرکە ساتدا سەر هەڵدەدات ئەویش سەبارەت بە چۆنێتی دابەشکردنی دەسکەوتەکان , بۆ جارێکی تر و بەمەبەستی یەکلاییکردنەوەی یەکجارەکی ئەم گرێ کوێرەیە خوای گەورە لە ئایەتی ٤١ی سورەتی ئەنفالدا چۆنێتی دابەشکردنەکەیان بۆ روون دەکاتەوەو دەفەرمێت : ( واعلموا انما غنمتم من شیء فان لله والرسول والذی القربی والیتامی والمساکین وابن السبیل ان کنتم امنتم باللە وما انزلنا علی عبدنا یوم الفرقان یوم التقی الجمعان وللە علی کل شیء قدیر ) .

کەچی دوای سەدان ساڵ لەم رووداوە , رژێمی بەعس رێک لە ژێر ناوی ئەنفالدا گەلی کوردی موسوڵمان لەسەر خاک و زێدی باوباپیرانی خۆی بەشێوەیەک دەخاتە چوارچێوەی ئەنفالەوە , کە مێژووی مرۆڤایەتی کارەساتی لەم چەشنەی بەدەگمەن بەخۆوە بینیوە . ئەنفالێک کە تەرو وشک , پیرو گەنج , منداڵ و گەورە, پیاو و ژن , سروشت و گیانلەبەر , تەنانەت مزگەوت و قورئانەکانیش

دەسوتێنرێن و ئەنفال دەکرێت . هەر ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی پەلامارە ئەنفال بەر لەوەی هەڵمەتێک بێت بۆ لەناو بردنی شۆڕشی چەکداری کورد , پرۆسەیەکی گشتگیرو فرەرەهەند بووە بۆ :

١. کوشتن و لەناو بردنی زۆرترین ژمارەی مرۆڤی کورد بەهەردوو رەگەزەکەوە , بەمەبەستی کەمکردنەوەی رێژەی کورد لە عێراقدا .

٢. لە ناوبردن و تەفرو تونا کردنی سەرچاوەی بوژاندنەوەو حەوانەوەی بزوتنەوەی چەکداری لە کوردستان .

٣. تۆڵە سەندنەوە لەلادێ نشینان , بەتۆمەتی ئەوەی کە لە شەری هەشت ساڵەی نێوان عێراق / ئێران بوبونە جێگای حەوانەوەی هەزاران سەربازی هەڵهاتوو لەبەرەکانی شەر , سەرباری ئەوەی گوندەکان لانەو بنکەی حەوانەوەی پێشمەرگە بوونە .

٤. زیان گەیاندن بە لایەنی ئابووری کۆمەڵگای کوردەواری بەتایبەتیش گوندنشینان لە بواری کشتوکاڵی و ئاژەڵداریدا , کە دوو سەرچاوەی سەرەکی بوون بۆ بووژاندنەوەی ئابووری کوردستان .

٥. تێکدان و شێواندنی بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەتەوایەتی

٦. بێ سەرو شوێنکردنی هەزاران ژن و مندالْ و پیاوی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان .

٧. وێرانکردنی هەزاران گوند و چەندین شارو شارۆچکە .

٨. سرینەوەو شێواندنی مێژوو کلتوور و فەرهەنگی نەتەوایەتیمان , لەبەرامبەردا کارکردن بۆ چەسپاندنی کلتوری نەتەوەی سەردەست بەسەر هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگای کوردەواریدا .

٩. تێکدانی باری کەسێتی و هەڵوەشاندنەوەی شیرازەی خێزانی لە نێو لادێ نیشینەکاندا .

١٠. بەسوتماککردنی بەشێکی فراوان و گرنگی خاکی کوردستان .

بەهەر حاڵ تراژیدیای ئەنفال برینێکی قوڵ و بەسۆی لەسەر جەستەی کورد بەجێهێڵا , کە زۆر ئاسان نیە لەمەودای نزیکدا ساریژ بێت . هەر بۆیە مەرگە ساتی ئەنفال بوە هێمایەوک بۆ مەزڵومێتی گەلی کورد لەسەدەی بیستەمدا , کە جێی داخە ئەم کارەساتە بەو قەبەیەوە لەئاستی نێو دەوڵەتیدا لەکاتی خۆیدا دەنگی نەدایەوە وەک کارەساتێکی مرۆیی و سیاسی لە ئاستی جیهاندا تەماشا نەکرا ئەگەر چی جیهان لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم کارەساتی وا گەورەی بەخۆوە نەبینیبوو , وەلێ بەرژەوەندیە سیاسی و ئابووریەکان وای دەخواست کە هەموان بێدەنگی هەڵبژێرن لە ئاست ئەو کۆمەڵکوژیەدا , ئێستاش بێگومان دوای نەمانی رژێمی بەعس پێم وایە قورسە بۆ ئەوان قسە لەسەر گەورەیی ئەم تاوانە بکەن چونکە یەکەمجار خۆیانی پێناشرین دەبێت .

سـەبـــارەت بـەرژێـــمی ئـەنفالـچی بــەعس و کلتورەکــەی , ئــەوا ئــەم مەرگەساتەی کـورد بێشـک بـوّتە خاڵێکی رەش لە نێو لاپەرەکانی مێژووی پر لە کارەسات و خـوێـناوی عـێراقدا کـە هـەمیشە جـێگای شـوورەییە بـۆ کلتـوری نەتـەوەی سەردەسـت کــە عـەیـامـێکە لــە ژێــر نــاوی جیاجیادا ئەنفالیان کردۆتە پەیامێکی شەرعی . ئـێستاش ئاسـان نیە ئــەم جینایەتـە لە کــوڵی مـێژووی خـۆیانی بکەنەوە چونکــە ئــەو رژێـم و سوپایـەی کــە ئەنفالی بەناهەق بریە بالأی کورد , کوری دڵسوز و بـەوەفــا بــوون بــۆ یـاسـاو کلــتوری بیابــان . خــۆ ئـەوەتـا ئێـستاش بـەشـی هــەرە زۆری عـەرەب چ لە عێراق و چ جیهانی عـەرەبیدا شـانازی دەکـەن بـەشــەر و جـەنگــە خـوێناویـەکانی بـەعس و سـەدامــەوە , دیــارە بـــەو جـەنگــە نارەوایيـشەوە کـە دەرهـــەق بــە گـەلــی کـوردی مـوسـوڵمان هـەڵــی گـیرسـاند کـە ئەنجامـەکەی مەرگەساتی ئەنفال و کیمیابـارانکـردنــی کـوردستانی لیّ کـەوتەوە . ئـاشـکـرایـە ئـەو چـەنـد مـلیوّن کـەسـەی کە لـە رابـردوودا ئـەنـدامی دڵسوّزی بـەعـس بــوون و لــە ئـەنجامــدانی هـەرجـەنگێکی خـوێـناوی و کاولـکەردا بـەشـداربـوون و چـەپڵەیــان بــۆ سـەروّکـی نـەتەوەیی عـەرەب و پارێزەری دەروازەی رۆژهــەلأت لێدەدا , ئـاخر دەبێـت ئـەوانیش تاوانبـار نـەبن .. پێـنج ملیـوّن ئــەندامی حــزبی بـەعس و زیـاتر لـە یـەک ملیـوّن سـەربــاز و ســەدان هـەزار جـەلادی ســوپــای مـیللی و دەزگـاکـانــی هــەواڵگری و ئاسـایش و موخابـەرات و هـێزەکانـی بـەنـاو فـیدای سـەدام ... هـتد . ئـاخــر هـەمــوو ئـەمانە کـارئـەکـتــەری ســەرەکی و عـەبـدی مـوتیعی سـەدام نـەبوون لـە کـردەی

ئەنفال و هەموو تاوانەکانی تردا . ئەی ئەمانە هەمووی کوری کێ بوون ؟ خەڵکی کوێ بوون و ؟ سەربەچی نەتەوەیەک بوون ؟

راستە سەدام ئەندازیارو نەخشە کێشی پەلاماری ئەنفال بوو بۆسەر کوردستان , بەڵام ئەوانەی منداڵیان لە بێشکەدا گولە باران دەکرد .. ئەوانەی هەتکی ناموسی ژن و کچی پاکیزەی کوردیان دەکرد .. ئەوانەی قورئان و مزگەوتەکانی خوایان دەسوتان و دەرۆخاند .. ئەوانەی ئاگریان بەردەدایەماڵی جوتیاران و دوای تالانکردنی هەموو گوندێکیان دەسوتاند .. ئەوانەی فرۆکەوان بوون و بۆردومانی کوێرانەی خەڵکی سڤیل و بێ گوناهیان دەکرد .. ئاخر دواجار دەپروسم حەجاج و شەوقی و موقەدەم حەسەن .. هەموو ئەمانە کوری کێ بوون و سەربەچی کلتورو نەتەوەیەک بوون ؟

بۆیە لەبەرامبەر تراژیدیای ئەنفالدا , تەنها سەدام تاوانبار نیە بەڵکو مێژوو کلتورو بەملیۆنان جەلاد لە عێراقدا تاوانبارن , بۆیە ئیتر پێم وایە دەبێت یاسایەک دەربکرێت تاکو کلتورو مێژوو و هەموو جەلاد بدرێن بەدادگا , بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەنفال دووبارە نەبێتەوە , کوردیش ئیتر لەبەر هەر هۆیەک بێت دەبێت لەسەر خاکی خۆی بمرێت و بنێژرێت , نەک لەعەرعەر و نوگرە سەلمان و وڵاتی سارا نشین .

# ئەنفال وەك بڕیارێك

بەچەندین ساڵ بەر لە دەستپێکردنی پەلاماری ئەنفال بۆسەر کوردستان , لە چوار چێوەی سیاسەتی قڕ کردن و پاکتاوی ڕەگەزیدا , سەرقاڵی پچڕ پچڕ کردن و لەقاڵبدانی خاکی کوردستان بوون, بەکارهێنانی سیاسەتەکانی (بەعەرەب کردن , ڕاگواستن , تەبعیس ..هتد) چەندین شێوازی مەترسیداربوون , بۆسەر بەرژەوەندی و ئایندەی چارەنوسی کوردو دۆزە ڕەواکەی . بەڵام جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق _ ئێران وای لە رژێم کردبوو کە نەتوانێت سەد دەرسەت هەموو ئامانج و نەخشە ترسناکەکانی لەسەر خاک و گەلی کوردستان بهێنێتە دی , بۆیەهەمیشە لە هەلو دەرفەت دەگەرا تاکو تەواوی مەرامەکانیان پراکتیزە بکەن و کوردستان بەگەل و خاکەوە لەبۆتەی عێراقی عەرەبیدا بتوێننەوە . وە لێ بۆ ئەو مەبەستە دەمێک بوو بەعس وسەرۆکەکەی لە هەل و دەرفەت دەگەران . کاتێکیش ئەو جەنگە خوێناویەی نێوان هەردوو وڵاتی دراوسێ و موسڵمان رووڵە کۆتای بوو , ئەوجا سەرۆکی سوپای جەنگە نارەواکان کەوتە دانانی نەخشەو پیلانی ترسناک بە ئامانجی قڕکردنی کوردو بەسوتماک کردنی خاکەکەی, دیارە بۆ گەیاندنی ئەو ئارمانجەش ,سەدام خوازیاربوو جێبە جێکردنی ئەو ئەرکە بە یەکێک بسپێرێت بە ئەندازەی خۆی درندەو خوێن ڕێژ بێت , تاکو لەجینۆ سایدو کێومالکردنی کوردستاندا تۆزقاڵێک

بەزەیی و ویژدان شک نەبات , وەلێ ئەوەش بەرژەوەندی بەعس و میتۆدەکەی تیایدا سودمەند دەبێت ,دەقاودەق پەیرەو بکرێت .بێگومان ئەو دەمە باشترین کەسیش کە جێگای باوەر و متمانەی سەدام بێت بۆ ڕاپەراندنی ئاواکارێک , خودی (علی حسن المجید) ی ئامۆزای بوو . عەریف عەلی کەدواتر لەناو کوردا بە عەلی کیمیاوی ناسرا , زۆر بەشانازیەوە ئەو فەرمانەی سەرۆکەکەی قبوڵکرد, چونکە ناوبراو بەخوێن ڕێژ ترین کەسی ناو سوپاوحزبی بەعس ناسراو بوو .دیارە بیرۆکەی شاڵاوی ئەنفال بۆ سەر کورد ,سەرتا تەنها لەلایەن خودی دیکتاتۆری عێراقەوە بەر جەستە بوبوو, پاشان بۆراپەراندنی ئەو نەخشەیە عەلی حەسەن ئەلمەجید لێ ئاگادار کرایەوە , دواتر بۆ جێبەجێکردنی وا پێویستی دەکرد بە فەرمی لەچواچێوەی بریارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشدا , ناوبراو دەستکراوە بکات بۆدانانی بەرنامەو پیلانی گونجاو بۆئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە لەکات و شوێنی خۆیدا .ئەوەبوو بەپێی بریاری ژمارە (١٦٠)لەبەرواری ٢٩ /٣/١٩٨٧ بەناو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ,بەفەرمی ئەو ئەرکەی بە عەلی حەسەن ئەلمەجید ڕاسپارد کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی بریارەکەیە :

بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە

بەناوی گەل

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش

ژمارەی بریار/١٦٠

مێژووی بریار /١٩٨٧/٣/٢٩

بڕیار

بەپشت بەستن بە برگەی (٦)لەمادەی (٤٢) و برگەی (٦) لەمادەی (٤٣) لە دەستور بۆ جێبەجێکردنی بریارەکانی کۆبونەوەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش و سەرۆکایەتی هەرێمی حزبی بەعسی ئیشتراکی لە (١٩٨٧/٣/١٨) ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش لەکۆبونەوەی ١٩٨٧/٣/٢٩ئەم بریارانەی دا :

یەکەم : عەلی حەسەن ئەلمەجید ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بکرێ بەنوێنەری سەرکردایەتی هەرێمی حزب و ئەنجومەنی بالأی شۆرش بۆ جێبە جێکردنی سیاسەتی سەرکردایەتی حزب و ئەنجومەنی سەرکردایەتی لەسەراپای ناوچەکانی ژوورو ناوچەی کوردستان و حوکمی زاتی , بۆ جێبەجێکردنی ئەمن و ئاسایش دابین کردنی دڵنیایی و جێبەجێکردنی یاسای حوکمی زاتی لەناوچەکەدا.

دووەم: عەلی حەسەن ئەلمەجید ئەندامی سەرکردایەتی هەرێم , بۆ ئامانجەکانی ئەم بریارە هەموو دەسەلأتێکی پێ دەدرێ,بۆ جێبەجێکردنی بۆهەموو دەزگای مەدەنی و عەسکەری و ئەمنی و لیژنەی کارو باری باکور

سێیەم : هەموو لا یەنەکانی خوارەوە , لەهەموو ناوچەکانی سەروو پەیوەندی دەکەن بەهاوریٚ ئەندامی سەرکردایەتی هەرێم , پابەند

دەبن بە هەموو بریارو فەرمایشتەکانەوە کەلەوە وە دەردەچیٚ و جێبە جێکردنی پێویست دەبێ بە پێی ئەم بریارە :

١- ئەنجومەنی تەنفیزی ناوچەی کوردستانی حوکمی زاتی

٢-پارێزگاری پارێزگاکان سەرۆکی یەکە ئیداریەکانی سەربە وەزارەتی حوکمی محلی

٣- دەزگای موخابەرات , هێزی ئەمنی ناوخۆ و ئیستخباراتی عەسکەری.

٤- سەرکردایەتی سوپای میللی .

چوارەم: پابەند بونی سەرکردایەتی عەسکری لەو ناوچانە بەفەرماندەی هاورێ سەرکردایەتی هەرێم , لەهەموو ئەوانەی لەیەکەم برگەدا لەم بریارەدا هاتووە

پێنجەم : ئەم بریارە لەبەرواری دەرچونیەوە کاری پێدەکرێ تاکاتێکی

نەزانراو , کارکردن بەهەموو برگە یاسایەکانی تر رادەگیرێ کە لەگەلٚ

ئەم بریارەدا ناگونجێ

سەدام حوسێن

سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش

## الرحمن الرحيم

الثورة

١٦

١٩٨٧/٣/٢٩

### قرار

أحكام الفقرة (٦) من المادة الثانية والاربعين , والفقرة (٦) من ... والاربعين من الدستور وتنفيذاً لما تقرر في اجتماع المشترك ... قيادة الثورة والقيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي المنعقد في ... قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة في ١٩٨٧/٣/٢٩ مايلي

... الرفيق علي حسن المجيد , عضو القيادة القطرية لحزب البعث ... اكي , بتمثيل القيادة القطرية للحزب ومجلس قيادة الثورة في تنفيذ ... في عموم المنطقة الشمالية منطقة كردستان للحكم الذاتي بهدف حماية ... وكفالة الاستقرار فيها وتطبيق قانون الحكم الذاتي في المنطقة .

... لرفيق عضو القيادة القطرية , لتحقيق اهداف هذا القرار صلاحية ... لجميع اجهزة الدولة المدنية والعسكرية والامنية , بوجه خاص ... لمنوطة بمجلس الامن القومي ولجنة شؤون الشمال .

... الجهات التالية في عموم المنطقة الشمالية بالرفيق عضو القيادة ... زم بالقرارات والتوجيهات الصادرة منه التي تكون واجبة التنفيذ ... القرار



بسم الله الرحمن الرحيم

باسم الشعب

مجلس قيادة الثورة

رقم القرار / ١٦٠

تاريخ القرار / ٢٩ / ٣ / ١٩٨٧

قرار

استنادا الى احكام الفقرة (أ) من المادة الثانية والاربعين ، والفقرة (ج) من المادة الثالثة والاربعين من الدستور ، وتنفيذا لما تقرر في الاجتماع المشترك لمجلس قيادة الثورة والقيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي المنعقد في ١٨/٣/١٩٨٧ .

قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة في ٢٩/٣/١٩٨٧ ما يلي :-

اولا - يقوم الرفيق علي حسن المجيد ، عضو القيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي ، بتمثيل القيادة القطرية للحزب ومجلس قيادة الثورة في تنفيذ سياستهما في عموم المنطقة الشمالية بضمنها منطقة كردستان للحكم الذاتي بهدف حماية الامن والنظام وضمان الاستقرار فيها وتطبيق قانون الحكم الذاتي في المنطقة .

ثانيا - يكون للرفيق عضو القيادة القطرية ، لتحقيق اهداف هذا القرار ، صلاحية اتخاذ القرارات الملزمة لجميع اجهزة الدولة المدنية والعسكرية والامنية ، وبوجه خاص الصلاحيات المنوطة بمجلس الامن القومي ولجنة شؤون الشمال .

ثالثا - ترتبط الجهات التالية في عموم المنطقة الشمالية بالرفيق عضو القيادة القطرية وتلتزم بالقرارات والتوجيهات الصادرة عنه التي تكون واجبة التنفيذ بموجب هذا القرار .

١- المجلس التنفيذي لمنطقة كردستان للحكم الذاتي .

٢- محافظو المحافظات ورؤساء الوحدات الادارية التابعون لوزارة الحكم المحلي .

٣- اجهزة المخابرات وقوى الامن الداخلي والاستخبارات العسكرية .

٤- [illegible] الجيش الشعبي [illegible] .

رابعا - تلتزم القيادات العسكرية في المنطقة بأوامر الرفيق عضو القيادة القطرية بكل ما يتعلق بـ ( اولا ) من هذا القرار .

خامسا - يعمل بهذا القرار من تاريخ صدوره ويوقف العمل بالاحكام القانونية التي تتعارض واحكام هذا القرار .

صدام حسين

رئيس مجلس قيادة الثورة

١. المجلس التنفيذي لمنطقة كردستان للحكم الذاتي .

٢. محافظو المحافظات ورووساء الوحدات الادارية . التابعون لوزارة الحكم المحلي .

٣. اجهزة المخابرات وقوى الامن الداخلي والاستخبارات العسكرية .

٤. قيادة الجيش الشعبي .

رابعاً: تلتزم القيادات العسكرية في المنطقة اوامر الرفيق عضو قيادة القطرية بكل ما يتصل بـ(اولاً) من هذا القرار .

خامساً: يعمل بهذا القرار من تأريخ صدوره وحتى اشعار أخر , ويتوقف العمل بالاحكام القانونية التي تتعارض واحكام هذا القرار .

صدام حسين

رئيس مجلس القيادة الثورة

# بڕیارە پێش وەختەکانی
# عەلی حەسەن مەجید

دوای دەست بەکاربوونی عەلی حەسەن مەجید , وەک سکرتێری گشتی نوسینگەی باکور , کە راستەوخۆ بەرپرسیارێتی قڕکردنی کورد و بەسوتماککردنی خاکی کوردستان خرابووە ئەستۆی , پێش وەخت و بۆ باشتر ئامادەکردنی زەمینەی لەبار بۆ دەست پێکردنی شالاوی ئەنفال بۆ سەر کوردستان . لە نووسراوێکدا چەندین بڕیاری سەبارەت بەو پرۆسەیە ئاراستەی فەیلەقەکانی سوپاو داموودەزگا ئەمنیەکانی لە ناوچەکەدا کردبوو , تاکو کاری پێبکرێت و گوشارەکان زیاتر بکرێن بۆسەر ئەو ناوچانەی کەلە ژێر دەسەلاتی هێزی پێشمەرگەدا بوون .

ئەو بڕیارانەی کە لە نوسینەکەی ناوبراودا هاتبوون , دەتوانین بەسەرەتایەک ئەژماردەی بکەین بۆ نیاز و مەبەستی خراپی رژێمی بەغدا بەرامبەر بەکورد و شۆشەکەی . چونکە ئەو ئیجرائاتانەی کە راسپاردەی ئەلمەجید بوون , لە نووسراوی ژمارە (٤٠٠٨) لە ٢٠حوزەیرانی ١٩٨٧ بەئاشکرا ئاماژەی بۆ دەست پێکردنی پرۆسەی قڕکردن و یاساخ کردنی ژیان دەکرد لەو ناوچانەدا .

بەپشت بەستن بە بریارو فەرمانەکانی ناوبراو , دامودەزگا ئەمنی و سەربازیەکان لە سنووری قەزای خورماتوو , تا دەهات ئیجرائاتی توندیان بەهەموو ئاراستەکاندا ئەنجام دەدا و گوشاری جۆراو جۆریان دەخستە سەر

گوندنشینانی سنوورەکە کەخۆی لە گوندەکانی هەردوو ناحیەی ( قادر کەرم (وانەوجول) دەبینیەوە .

لەمانەی لای خوارەوەش بەشێکن لەو سیاسەتانەی کە بەچەندین مانگ پێش پەلامارەکانی ئەنفال بۆ سەر ناوچەکە پەیرەو دەکران:-

١. چەسپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بۆسەر گوندنشینانی سەربەناوچەکانی (داوێ , بناری گل , زەنگەنە ... هتد )

٢. گوشار خستنە سەر هاتوچۆی نێوان شارو لادێ .

٣. ئەنجامدانی هێرشی کورت خایان بۆسەر ناوچەکەو وێرانکردنی دەیان گوند , بەتایبەتیش بۆسەر ئەو گوندانەی کە لە مۆلگا سەربازی و رێگا سەرەکیەکانی نێوان (خورماتوو-نەوجول) و ( خورماتوو- قادرکەرەم ) و ( قادر کەرەم –کەرکوک ) ەوە نزیک بوون .

٤. بۆردومانی رۆژانەی فرۆکەو چەکی قورس بۆسەر گوندەکان و گەیاندنی زیانی مادی و گیانی زۆر بەدانیشتوان .

٥. دەستگیرکردنی سەدان هاولاتی گوندنشینی ئاسایی و پاشان شەهیدکردنیان بەتۆمەتی هەڵبەستراو . هەموو ئەو ناوچە گوندنشینانەی کە لە ژێر دەسەلاتی پێشمەرگەدابوو , هەمووی کراوە ناوچەی (محرمە) و هاتوچۆو ژیانی تێدا قەدەغەرکرا , لەبەرامبەردا سوپا سەرپشک کرا کەهەر جموجۆڵێک یان هەرچ کەسێک ببینرێت لەو ناوچانەدا .. یەکسەر بکوژرێت , دەرئەنجام کۆمەڵێک هاولاتی و جوتیاری بێ گوناهی ناوچە جیاجیاکان بوونە قوربانی ئەو بریارە ناراستە .

٦. ئــەم بریــارو هەڵــسوکەوتانەی ســوپاو داموودەزگاکــانی رژێــم ، بارودۆخەکـەی بەتـەواوەتی ئـاڵۆز کردبـوو ، تادەهـات دۆخەکـە بـەئاقاری شلْژان و نائارامیـدا دەچـوو ، پەیوەنـدی نێـوان شارو لادێ کـەوتبووە ئـەو پەری مەترسیەوە زیاتر بەقاچاغدا ئەو هاتوچۆیە ئەنجام ئەدرا ، سەرباری ئەوەی زیاتر ناوچەکە بەیەکە سەربازییەکان دەتـەنرا و هێـزی زۆرتـری بـۆ رەوانە دەکرا ، دیارە لەم بارو دۆخە ناسک و ناهەمواردا ژمارەیەک لـە فەوجـەکانی جـاش رۆڵـی هێجگـار خراپیـان دەبینـی لـە جێبـەجێکردنی ئـەو بریارانـەدا بەتایبـەتی بۆسـەر ناوچـەکانی (داوێ ، بنـاری گـل ) کەرۆژانـە سـوکایەتیان بـەهاولاتیان دەکـرد و هەنـدێک جـار زۆر لـە دامودەزگـا و سوپای بەعس دڵسۆزتر بوون بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بەغـدا ، هـەر بـۆ نموونـە چـەندین هـاولاتی گونـدەکانیان بەتۆمـەتی هەڵبەسـتراو تەسلیم بە داموودەزگا ئەمنی و ئستخباراتیەکان دەکـرد هـەر بـۆ ئـەوەی بەچالاکی بۆیان بژمێرێت .

سەرکردایەتی نووسینگەی رێکخستنی باکور ژمارە : ٤٠٠٨/٢٨

نووسینگەی سکرتاریەت مێژوو : ١٩٨٧/٦/٢٠

لە /فەرماندەیی نووسینگەی رێکخستنی باکور

بۆ / فەرماندەیی فەیلەقی یەک ، فەیلەقی دوو ، فەیلەقی پێنج

بابـەت / مامەڵـەکردن لەگـەڵ ئـەو گوندانـەی کەلەبـەر هۆکـاری ئـەمنی قەدەغەکراون

لەبەر رۆشنایی ئەوراستییەی کەدوا مۆڵەتی فەرمی راگواستنی ئەم گوندانە لـە ١٩٨٧/٦/٢١ دا کۆتـای دێـت , بریارمانـدا ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە لـە ٢٢/حوزەیرانی١٩٨٧ ەوە جێ بەجیبکرێت :-

١. هـەموو ئەوگوندانــەی کــە تێکــدەران — بــەکریٚ گیراوانـی ئێـران و خیانـەتکارانی لـەو چەشـنەی دەرهـەق بـەعێراقیان تێـدا بێـت لەبـەر هۆکاری ئەمنی بەقەدەغەکراو دادەنرێت.

٢. ئـەم شوێنانە بەناوچـەی عەمـەلیات دادەنرێـت و بـوونی مـرۆڤ و ئاژەڵ تیایانــدا بەتــەواوەتی قەدەغەیــەو هێــزە چــەکدارەکان بــیٚ هــیچ بەربەستێـک دەتوانن دەستیان لیٚ بکەنـەوە , تاوەکو راسپاردەی تریان لەلایەن نووسینگەمانەوە بۆ دێت .

٣. هاتوچۆ کردن بۆ ئەم ناوچانە , هەروەها هـەر چالاکییەکی ئاژەڵـداری و کـشتوکاڵی و پیـشە سـازی قەدەغـە دەبێـت و بەچـاکی لەلایـەن دەزگـا تایبەتمەندەکانەوە چاودێری دەکرێت .

٤. فەرمانـدەی فەیلەقـەکان پـەیرەوی بۆردومـانی کوێرانـەی ئـەو ناوچـانە دەکەن و تۆپخانەو هەلیکۆپتەرو فرۆکـە , هەموو کاتێـک بەشـەو بـەرۆژ بەکار دێنن , بۆ ئەوەی گـەورەترین ژمـارەی ئـەو کەسانی بکـوژن کەلـە ناوچــە قەدەغەکراوەکانــدان وە ئێمــەش لــە ئەنجامــەکانی ئاگــادار بکەنەوە.

٥. هـەموو ئـەو کەسـانە لـەو گوندانـەدا دەگیرێـن دەبـیٚ لەلایـەن دەزگـا ئەمنیەکانـەوە لێکۆڵینـەوەیان لەگـەڵ بکرێـت و ئەوانـەی تەمـەنیان لـە

نێوان ١٥-٧٠ساڵدایە پێویستە ئیعدام بکرێن , پاش ئەوەی زانیاری بەکەڵکیان لێ وەردەگیرێت و لەکاتی خۆیدا ئاگادار بکرێینەوە .

٦. ئەوانەی تەسلیم بەدەسەڵاتە حکومی و حزبیەکان دەبنەوە لەلایەن دەزگا تایبەتمەندەکانەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت بۆ ماوەی ئەوپەرەکەی ٣رۆژ کەدەکرێ درێژ بکرێتەوە , بۆ دە رۆژ ئەگەر پێویستی کرد , بەمەرجێ لەهەموو حاڵەتەکان ئاگادارمان بکەنەوە . ئەگەر لێکۆڵینەوەکە پێویستی بەماوەیەکی زۆرتر بوو پێویستە بەتەلەفون یان بورسکە رەزامەندی ئێمە یان هەڤاڵ زاهیرالعانی وەربگیرێت .

٧. هەموو شتێک کەلەلایەن موستەشارەکان و فەوجەکانی بەرگری نیشتمانیەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت بۆ خۆیان دەبێت جگە لە چەکی قورس و دابەستراو مامناوەندی , ئەوان دەتوانن چەکە سووکەکان بۆ خۆیان گلبدەنەوە , بەمەرجێ تەنها ئاگاداری ژمارەی ئەو چەکانەمان بکەنەوە .

فەیلەقەکان دەبێ بەخێرایی تەواوی موستەشارەکان و فەرماندە هاکارەکانیان و فەرمانەدەی یەکەکان ئاگادار بکەنەوەو زانیاری تەواومان بدەنێ سەبارەت بەچالاکیەکانیان لە نێو فەوجەکانی بەرگری نیشتمانیدا . بۆ زانیاریتان و دەست بەکاربوون لەناوچەی دەسەڵاتتاندا , ئاگادارمان بکەنەوە .

وێنە بۆ :-

سەرۆکی ئەنجوومەنی یاسادانان

سەرۆکی ئەنجوومەنی راپەراندن

دەزگای ئەمنی حزب

سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا

پارێزگاکان ( سەرۆکی لیژنە ئەمنیەکان ) ی نەینەوا , التأمیم , دیالی , صلاح الدین, سلیمانی , هەولیر , دهوک .

ئەمینداریێتی لقەکانی (حزبی بەعس ) ی ئەو پارێزگایانەی لەسەرەوە ناوبران

بەرێوەبەرێتی گشتی ئستخباراتی سەربازی

بەرێوەبەرێتی گشتی ئاسایش ( ئەمن )

دەزگای ئستخباراتی ناوچەی باکور

دەزگای ئستخباراتی ناوچەی رۆژهەلات

بەرێوبەرەکانی ئاسایشی پارێزگاکانی نەینەوا , تأمیم , دیالی , صلاح الدین , سلیمانی , هەولیر , دهوک .

ئیمزا

هەڤاڵ

عەلی حەسەن مەجید

ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی

سکرتێری گشتی نووسینگەی باکور

قيادة مكتب تنظيم الشمال
مكتب السكرتارية
العدد : ٤٠٠٨/٢٨
التأريخ : ١٩٨٧/٦/٢٠
من / قياداة مكتب تنظيم الشمال
الى / قيادة الفيلق الاول , الفيلق الثانى , الفيلق الخامس

م / التعامل مع القرى المحذورة امنياً

بالنظر لانتهاء المهلة المعلنة رسميا لتجميع هذه القرى والتي سينتهي موعدها يوم ٢١حزيران١٩٨٧ قررنا العمل ابتداء من يوم ٢٢حزيران ١٩٨٧ صعوداً بما يلي :-

١. تعتبر جميع القرى المحذورة امنياً والتي لم تزال لحد الان اماكن لتواجد المخربين عملاء ايران وسليلي الخيانة وأمثالهم من خونة العراق .
٢. يحرم التواجد البشري والحيوانى فيها نهائياً وتعتبر منطقة عمليات محرمة ويكون الرمي فيها حرة غير مقيداً باية تعليمات مالم تصدر من مقرنا .
٣. يحرم السفر منها واليها أو الزراعة والاستثمار الزراعي أو الصناعي أو الحيواني وعلى الجميع الاجهزة المختصة متابعة هذا الموضوع بجدية كل ضمن اختصاصها .
٤. تعد قيادات الفيالق ضربات خاصة بين فتره أخرى بالمدفعية والسمتيات والطائرات لقتل اكبر عدد ممكن ممن يتواجد ضمن هذه المحرمات وخلال جميع الاوقات ليلا ونهارا واعلامنا .
٥. يحجز جميع من يلقى عليه القبض لتواجده ضمن قرى المنطقة وتحقق معه الاجهزة الامنية وتنفذ حكم الاعدام بمن يتجاوز عمره (١٥-٧٠) سنة بعد الاستفادة من معلوماته واعلامنا .
٦. تقرر الاجهزة المختصة بالتحقيق مع من يسلم نفسه الى الاجهزة الحكومية او الحزبية لمدة اقصاها ثلاثة ايام واذا تطلب الامر

لحد عشرة ايام ولابد من اعلامنا عن مثل هذه الحـــالات واذا استوجب التحقيق لهذه المدة عليهم اخذ موافقتنا هاتفيا أو برقيـــا عن طريق الرفيق طاهر العاني .

٧. يعتبر كل ما يحصل عليه مستشار والدفاع الوطني أو مقاتلوهم , يوزع اليهم مجانا, ماعدا الاسلحة الثقيلة والسائدة والمتوسطة , اما الاسلحة الخفيفة فتبقى لديهم ويتم اعلامنا باعداد هذه اسلحة فقط . وعلى قيادة الجحافل ان تنشط لتبليغ جميع المستشارين وأمراء السرايا والمفارز واعلامنا بالتفصيل عن نشاطاتهم ضمن افواج الدفاع الوطني .

الرفيق
علي حسن المجيد
- عضـــــو قيادة قطرية

نسخة منه :
رئاسة المجلس التشريعي
رئاسة المجلس التنفيذي
- جهاز مخابرات
- رئاسة اركان جيش
- محافظوا ورؤساء اللجان الامنية ( نينوى , التـــاميم , ديـــالى , صلاح الدين , السليمانية , اربيل , دهوك ) .
- امناء سر فروع المحاغظات اعلاه
- مديرية الاستخبارات العسكرية العامة
- مديرية الامن العامة
- مديرية الامن منطقة الحكم الذاتي

منظومة استخبارات المنطقة الشمالية
- منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

مدراء امن المحافظات اعلاه . يرجى الاطلاع والتنفيذ كل ضـــمن اختصاصه .

هەر بە هۆی ئەم هەڵوێستەوە بوو لە لایەن ڕژێمەوە ئاشکرابوو ،کە پاشان لـە لایەن دەزگای هەواڵگریەوە دەستگیر کراو دوای بە زەحمەت لە پەتی سێدارە رزگاری بوو . هە ر ئەم پیاوەش بوو لە ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١لـە گـەڵ دوو برایدا لـە (قەرەهـەنجیر) لـە شـەڕیکی قارەمانانـەدا لـە بەرامبـەر سـوپای بەعس وچەکدارەکانی بەناو موجاهید خەڵقەوە شـەهیدبوون وچـوونە کـاروانی نەمرانەوە .

بۆیـە جـێ خۆیـەتی ئـەمڕۆ بـە شـانازییەوە بڕوانینـە ئـەو دوو هەڵوێـستەی جەماوەری خۆڕاگر وقارەمـانی شـاری خورمـاتوو . چـونکە بێگومـان ئـەم دوو جۆامێرییە دەچنە پا ڵ خەرمانی سەروەریەکانی تـری ئـەم دەڤـەرە و خەڵکـە تێکۆشەرەکەی .

## بە سەر هاتی واحید .......

لە سەرەوەختی کارەساتی ئەنفالدا ، چەندین هـاوڵاتی کەوتنـە نێـو دۆزەخـی ئەنفالەوە ،پاشان بە زەحمەت لـە مـەرگی مـسۆگەر ڕزگاریـان بـوو وگەڕانـەوە کوردستان ،کە ئێستا ئەوان خاوەن گەلیك چیرۆکی سەر سوڕهێنەرن کـە تێـدا وەك شـانۆ یـان وەکـو فلیمـی سـینەمایی ڕووداو بەسـەرهاتەکانیان لـە نێـو بوخچەی هزر و بیریاندا وەکو بەڵگە وە شایەتگەلێك بۆ مێژوو تۆمار کردووە . جگە لـە مـەش بوونەتـە بەڵگـەی زینـدوو بـۆ تاوانـەکانی بـەعس لـە هەمبەر کـورد دا بـە تایبـەتیش لـە تراژیـدیای قڕکـردن و بـە سـوتماك کردنـی کوردستان .

بەشیك لەو هاوڵاتیانەش كە لە سەرە مەرگدا لە چنگی جەلادەكان وكێڵەی شۆفەڵەكان دەربازیان بوو ، خەڵكی دەڤەری گەرمیانن

هاوڵاتی (واحید حمە سەعید ) كە خەڵكی گوندی كانی قادری قەڵایە لە ناوچەی (بناری گل ) . یەكێكە لەو شایەتحاڵانەی كە لەنێو تراژیدیای مەرگێكی مسۆگەردا لە چنگی كوردكوژەكان بە زەحمەت هەڵدێت وئێستا لە ژیان دایە .

كاتیك پەلاماری ئەنفال بۆ سەر بناری گل دەست پێدەكات ،ئەمیش بە خاوخێزانەوە تە سلیم دەبنەوە ، لەوێش دەكەوێت دەستی ئەنفالچیەكان وڕەوانەی سەنتەری دواناوەندی ڕەشید دەكریت لە شاری خورماتو ، كە سەنتەریكی كاتی بوو بۆ كۆكردنەوەی ئەنفال كراوەكانی نازچەكە . پاش چەند ڕۆژیك دەگوازرینەوە بۆ كامپیك لە نزیك تكریت ، لەوێ ژن وپیاو لە یەكتر جیادەكەنەوە . واحید وسەدان وەكو ئەو دەبرێن بۆ كامپی تۆپزاوا لە خوارووی كەركوك ، لەوێشەوە دەبرێنە سجنیك لە ناوەندی شاری كەركوك .نزیكەی (٣)ێ ڕۆژ بێخواردن گلدەدرێنەوە وتەنها ئاویان پێ دەدەن . پاشان دەست وچاویان دەبەستنەوە وبە ئۆتۆمبۆبیلی داپۆشراو ولە چەشنی قەفەس دەخرێنە ڕێ . بە گوێرەی زانیاری خودی ناوبراو بۆ ماوەی (١٨) كاتژمێر بەڕێوە دەبن، وەكو خوی دەیگێڕێتەوە ودەڵێت (تەماشامان كرد سەیارەكان لە جادە لادران وهێواش بوونەوە ودەنگی تەقە بەرزبووەوە ، یەكێكمان لە گەڵدا بوو ناوی ئەنوەر تەیار بوو ،دیار بوو كوڕیكی ئازاو زریا بوو ، یەكسەر پێمانی ووت كوڕینە دەكوژرێن ودوژمن نیازی خراپە. هەر سەیارەیەك دوو ئینزباتی تێدابوو . جاریكی تر دەست وچاومانیان بە پارچە قوماشیك بەستەوە ،ئیتر زانیمان دەكوژرێن ، لە پڕا دەرگای سەیارەكەی

ئێمەیانیش کردەوە دوو کەسیان بــۆ ڕەمـی کـردن داگـردە خـوارەوە پاشـان پەلی

ئـەنوەریانیش ڕاکێـشا ، بـەڵام ئـەو زۆر مەردانـە لێـان هاتـە دەسـت وخـوی ڕاپسکان وپەلاماری کلاشینکۆفەکەی دەستی ئینزباتەکانـدا وتەقـە دروسـت ، هەردوو ئینزباتەکە بە دەستی ئەنوەر هەر لەوێدا کـوژران ، ئـیتر لـە چەندین لاوە دەستڕێژمان لێ دەکرا ، زۆرمان لەوێدا کوژرا . ئیتر ئەوەندە ئاگادار بووم من و ئەنوەر هەڵهاتین

تۆزیك ڕێمان کرد بەو شەوە وئیتر نازانم چۆن لە یەکتر دابڕاین ، هەنـدیك ڕێـم کرد تەماشام کرد ئازار وتەڕاییەك گەیشتە پشتم ، ئەوجا زانیم برینـدار بوومـە ، بـەڵا م نەوەسـتام وکەوتمـە سـۆراخی ئـاوە دانیـدا ، تـا دوور دەکەوتمـەوە دەنگی تەقەکان کەمتر دەبووەوە ،مەسافەیەك ڕێم کرد ، تروسکاییەکم بە دی کرد ، تۆزیك لێ نزیك بوومەوە ، سەیرم کـرد ڕەبایـەی عەسـکەرییە ، بۆیـە بـە هێواشی گەڕامـە دواوە . بـە قۆڵێـك تـر دا کەوتمـەوە ڕێـی ، مەسـافەیەکی تـر چووم تروسکاییەکی تـرم بـە دی کـرد و وردە وردە لێ نزیـك بوومـەوە سـەیرم کرد ماڵێکی دەوارنشینە ، سەگی ماڵەکـە پەلامارەیـدا وئـیتر خـاوەن ماڵەکـە هاتنە دەنگمەوە ، بە عەرەبییەکی شەل وکوت تێیانم گەیاند ، خوا هەڵناگریت زۆر مەردانە بردمیانە ماڵەوە ، کوڕێکیان عەسکەر بـوو بـە ئیجـازە لـە ماڵـەوە بوو هەندێك تەداویمی کرد . لە ڕێگای ماڵکەوە زانیم کە ئەم ناوچـەیە سـنوری پاریزگایرومادییە ، پاشان جل وبەرگەکانمیان گۆڕی وتێر نـان بـووم ، پێیـانم ووت دەمـــەوێت بگەڕێمـــەوە ناوچـــەی خـــۆم . خـــوا هـــەڵناگرێت کـــوڕە سـەربازەکەیان ووتــی پەلـە مەکـە مـن دەگەڕێمـەوە وەحدەکـەم وهـەر کـە گەڕامــەوە خــۆم دەتبەمــەوە . بـۆ مــاوەی (٢٠) ڕۆژ لــەوێ مامــەوە ،ئــیتر

کوڕەکەیان لە عەسکەری گەڕایەوە ، بە سەیارەی خویان هەڵمی گرت و بەرەو بەغدا کەوتینە ڕێ ، بردمێ کەراجی نەهزە لە بەغدا وبڕێك پارەی پێمدا ووتـی ئـەوە سـەیارەکانی کەرکوکـە وخواحافیزیمـان لەیـەکتر کـردو مـن سـواری سەیارەی کەرکوك بووم ، لە بە د بەختی مندا ئینزوبـاتێ لـە نـاو کەراجەکـەدا دەستیان کرد بە حەملە ، منیش هیچ موستەمسەکێکم پێ نەبوو بۆیـە کوتمـە دەستی دوژمن ، بەڵام هـەر لـە سـەرەتاوە ووتم مـن سـەربازی فـیرارم ، دوای ماوەیـەك حیجـز لـە بەغـدا ،پاشـان ئـازاد کـرام بـەو مەرجـەی بگەڕێمـەوە بـۆ عەسکەری.....هتد).

ناوبراو دوای ڕاپەڕینەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١لە لایـەن ڕیکخراوێکیبیانییـەوە ڕەوانەی دەرەوەی کوردستان کـرا بەمەبەسـتی چارەسـەرکردنی برینەکـەی . ئێستا نـاوبراو خـۆی وخێزانەکـەی لـە دەرەوەی وڵات ژیـانی ئاسـایی خۆیـان دەگوزەرێنن.

لە ڕاستیدا ئەمە هیچ نیە جگە لە کورتەیـەکی بـە سـەرهاتی (واحیـد) لـە ئـان وساتی مەرگەساتی ئەنفال دا .

# بەسەرهاتی ئاكۆ .........

ئەگەر بەوردی دیقەتی ڕەهەندە جیاجیاكانی پەلاماری ئەنفال بدەین ، تەنها بریتی نییە لە پرۆسەی قڕكردنی مرۆڤ وبەتاڵانكردنی سەروەت وسامانی كورد ، بەڵكو ئامانج تێدا وردتر ودوورتر بووە ، پرۆسەیەك بووە لە هەموو دەرگاكانی داوە بە دیوە نەگەتیڤە كەیدا ، بۆ تێكدان وشێواندنی ڕوخساری هەموو ڕاستیەكان .

شاڵاوی ئەنفال بۆ سەر كورد شاڵاوێكی گشتگیر وترسناك بوو ،تێدا ڕێز لە هیچ بەهاو یاسایەكی ئیلاهی وئینسانی نەگیراوهەموویان پێشێلكرد ،چونكە لە واقیعدا ئەوە ڕووی دزێوی سروشتی یاسای سارانشینە لە نێو دوورگەی عەرەبیدا ، كە بەرهەم هێنەری ئەنفالە لە ئەنفالدا بەعس یاسا جوان وپڕ بەهاكانی كۆمەڵگای كوردەواری شێواند و زنجیرەی كۆمەڵایەتی بچڕاند وهەزاران خێزانی لە یەكتر ترازاند ، سەدان منداڵ ودایك وباوك وبرای لە یەكدی بزركرد وتاهەنووكە بێ سەروشوێنن .

بێشك بەسەرهاتی ئاكۆ یەكێكە لەو سەدان وهەزاران بە سەرهاتەی كە لە ڕۆژە ڕەش وسەختەكانی تراژیدیای كوردئەنفالدووچاری بوبوو .



**ئاكۆ عەزەدین ئیسماعیل**

**كە خەڵكی گوندی ( گرمك )ی**

سەر بە ناوچەی (داویّ)یە ، بە سەرهاتەکەی یەکیکە لەو چیرۆکانەی ڕۆژانی ئەنفال .پێشتر ئاکۆ وخێزانەکەی لە گوندە قەشنگ ودلگیرەکەی (گرمك)دا لەسەر ڕۆخی ئاوە سپی لە گەلّ دەیان خێزانی تری جوتیاری ناوچەکە ، ژیانی ڕۆژانەی ئاسایی خۆیان دەگوزەراند وبەئومێدەوە دەیانڕوانییە ئایندە .

کاتیك دێوەزمەیڕەشی ئەنفال ڕووی کردە پانتایی گەرمیان ، ئیدی لەو زێدە خۆشەویستەدا ژیان کەوتە بەرمەترسی لە ناوچون هێرشی ئۆردووی بەعس لە ژێر ناوی ئەنفالدا بۆ سەرناوچەکە دەستی پێکرد ،لە بەر چەند فاکتەریکی جیۆسیاسی هەر زوو داویّ بەخەستی کەوتە بەر پەلاماری سوپای ئەنفال . سەرباری بەتالآن بردنی تەواوی سەروەت وسامانی گوندنشینانی دەڤەرەکە ،بەدەگمەنیش ژن وپیاو منداڵ لە چنگی ئەو شالآوە دڕندەیە دەرباز یان بوو ،هەر بۆیە لە نێو کورەی ئەو کارەساتە شومەدا ، سەدان ئاکو ناو بوونە قوربانی وبە هەزاران مرۆڤی کورد لە خوارووی عێراق بزرکران، کە لە نێو هەر حالّەتیکدا چەندین چیرۆکی کارەساتباراویی دروست بوون ،هەر یەکەی بۆ خوی بابەتی فلیمێکی سینەمایی پڕ لە تراژیدیایە .

لە کاتی ئەنفالدا (ئاکۆ) تەمەنی تەنها چوار ساڵ بووە، وەك خوی دەیگێڕێتەوە زۆر بە دەگمەن وێنەکانی ئەو ڕۆژانەی بە یاد دێتەوە کاتیکیش بە خێزانەوە دەکەونە دەستی جەلادەکان ئەم نازانێت لە کویّ گیراون وبۆ کویّ براون ،بۆیە بەڕوونی ئەو شوێنانەی لاتۆمار نەبووە .

وەك دواتر لای (ئاکۆ) ڕوون دەبیتەوە ، دوای ئەوەی ڕەوانەی خوارووی عیراق دەکرین دایکی بە نەخۆشی ڕەوانەی نەخۆشخانەیەك دەکرێت لە بەغدای پایتەخت ، کە ئاکۆیشی لە گەلّدا دەبیت ، دایکی بە هۆی کاریگەری نەخۆشیەکەیەوە گیان لە دەست دەدا ، زۆر بیّ دەربەستانە لە نێو

قاوشەکەدا جەنازەی ژنە دادەنرێت ، بەڵام بە پارچە کاخەزێك هەندێك زانیاری دەنووسن ودەیدەن لە سەر سنگی ئاکۆ ، ئەویش بەدیار دایکیەوە دەگریت وهاوار دەکات ، لە وکاتەدا بەرێکەوت کابرایەکی بەغدادی بە ناوی (مەجید) کە کوردی فەیلی دەبێت،

بە مەبەستی بە سەرکردنەوەی برادەرێکی نەخۆشی سەردانی هەمان نەخۆشخانە دەکات ، بەڵام کاتێك ناوبراو دەگاتە ئەوێ ، تەماشا دەکات برادەرەکەی دەرچووە ،لە کاتی سوڕاندنەوەیدا لە ناو نەخۆشخانەکەدا ، سەیر دەکات منداڵێك بە کوڵ دەگیرێت ، بۆیە لێ دەچێتە ژوورەوە ، تەماشا دەکات جەنازەی ژنێك بە بێ خاوەنی کەوتووە و منداڵێك ها بە دیاریوە،یەکسەر پارچە وەرەقەکەی سەر سنگی منداڵەکە دەبینێت، کە نوسراوە یەکێکە لە وون بووەکانی دەوروبەری قەزای خورماتوو . هەرچۆنێك بێت کابرا تێدەگات مەسەلەکە چییە ، ئیتر ئەویش منداڵکە هەڵدەگرێت ودەیباتەوە ماڵ ، ماوەی (٦)مانگ لای خۆی دەیهێڵێتەوە . لێرەوە دەچینە لای خودی (ئاکۆ) تاکو زیاتر ئاشنا بین بەو بە سەرهاتە ولە سەر زاری خۆیەوە گوێمان لە هەموو زنجیرەکانی ئەو چیرۆکە واقعیە بێ ، ئەویش ووتی (ئەگەر سەیری تەمەنم بکەیت ئەوجا دەزانیت کەمن لە کاتی ئەنفال دا عومرم نزیکەی چوار ساڵێك بووە، سەرەتا ڕووداوەکانم بە باشی نەئەزانی من چیم بە سەردا هاتووە وکێم ،بەڵام دواترکاك مەجید لە نوکەوە بە سەرهاتەکەمی بۆم گێڕایەوە ئێستا منیش وەکو خۆی لە سەرەتاوە بۆتان دەگێڕمەوە.کاتێك بە خێزانەوە دەکەوینە دەستی بەعس،ئیتر نازانم ئەوە چۆن دەبێت ویەکسەر دەمانگوازنەوە بۆ شارەکانی خوارووی عیراق .دایکم دیارە بە خراپی نەخۆش دەکەوێت وبەمنیەوە ڕەوانەی موستەشفای دەکرین لە بەغدا ، لەوێ دایکم

ئەمری خوا دەکات ودەمریت ،منیش بەدیارییەوە بەتەنها دەگریم ، لەو کاتەداکاک مەجید وەکو فریشتە پەیا دەبێت ، کە لە ئەسڵدا کوردی فەیلی گەرەگی سەورەی بەغدا بوو ، لە موستەشفا بەرێکەوت دەکەومە دەستی وبە نهێنی دەمباتەوە ماڵ خۆیان ، نزیکەی شەش مانگیك لە ماڵدا دەمهێڵێتەوە ، پاشان وەکو خوی دەیگێرێتەوە دەترسیت لە لایەن دەزگاکانی رژێمەوە تووشی کێشە بێت ، لە رێگای برادەریکیّ وە دەمگوازێتەوە بۆ سجنی (ئەحداس) لە ئەبو غرێب ، لەوێش بۆ ماوەی ساڵێك دەمهێڵێتەوە ،بیّ ئەوەی من بزانم لە ماوەی ئەو ساڵە دا خواردن وجل وبەرگی بۆ هێناوە ، دوای ئەو ماوەیە رەوانەی شوێنیك تر کرام کە پاشتر زانیم
(رعایەاجتماعی)یە ، بەلام بە تەواوەتی بیرم لای مەجید براببوو ،توومەز ەمەجید بی ئاگای خۆم هەموو ئەم هاوکاریەم دەکات ، لەم شوێنەش زیاتر لە ساڵ ونیویك مامەوە ، پاشان واستەی بۆم کرد وئیتر گەرامەوە ماڵی ئەوان .
مەجید بەپیّ وەرەقەکەی سەر سنگم دەیزانی من لە ئەنفال کراوەکانم وخەڵکی سنوری دووزم. تاکو ساڵی ١٩٩٤وەکومنداڵیکی ئاسایی ئەو ماڵە ژیانم دەبردە سەر.
من دواتر زانیم پێش ئەنفال ماڵ باوکم ژنیکیان داوەبە کوریکی عەرەبی بەغدادی بە ناوی (موسە نا) کە وەختی خۆی فیراری عەسکەری بووە لە دێکەماندا ، بەریکەوت وا ئەبیت رۆژیك خزمیکی ماڵ مەجید کە برادەری موسەنا دەبیت دەکەونە گفتوگۆوە وپیّ دەڵیت موسەنا تۆ ژنەکەت خەڵکی سنوری دووزە ، لە کاتی ئەنفالەوە منداڵیك کەوتۆتە ماڵ مەجید خزمان ، تۆیش بە هۆی خێزانەکەتە زوو زوو سەردانی ئەو ناوە دەکەیت ، خێرت دەگات بزان پرسیاریك ناکەیت ،دوای ماوە یەك موسەنا سەردانی دووز دەکات

ولای خزمه کان باس ئەم مەسەلەیە دەکات ، دوای ئەوەی ناوی سیانیم بۆیان باس دەکات سەید ئەحمەد ومیکیکم دەکەونە دومانەوە . میمکەم یەکسەر دەڵێت دوا منداڵی عەزەدین برام ناوی ئاکۆ بووە . بەهەرحاڵ ڕیک دەکەون کە سەردانی بەغدا بکەن بۆ ئەو مەبەستە ، کاتیک دێنە ماڵی مەجید وزۆر هەوڵدەدەن کە قەناعەت بە ناوبراو بکەن تاکو من ببنەوە ، بەلام ڕازی نابیت بەم داوایە ، ناچار دەگەڕێنەوە بوو دووز ، دوای ماوەیەکی تر دیسان دەگەڕێنەوە بۆ بەغدا ، بەلام ئەمجارەیان بە کۆمەڵێك بەلگەوە دەگەڕێنەوە ، لە گەڵ مەجید دەکەونە گفتو گۆ ئەمان چەند نیشانەیەك منیان بۆ باس دەکەن ، ئیتر مەجید ڕازی دەبیت ومن دەگەڕێننەوە بۆ دووز...ئێستاش لە هەموو ڕاستیەکان تێگەیشتومە وا خەریکە وردە وردە ژیانی ئاسایی خۆم دەبەمە سەر و ژنیشم هێناوە....).

بە کورتی ئەمەی سەرەوە چیرۆکی بەسەرهاتی (ئاکۆ )بوو . کە ڕنگە ئەگەر لە زوبانی خۆیەوە نەمانبیستبایە ،ئاسان نەبوو بڕوابەم بەسەرهاتە بکەین .

## کچە پاکیزەکانی گەرمیان دووجار ئەنفال کران

یەکیك لە هەرە خەسڵەتە خراپ ونادروستەکان ڕژێمیبەعس ودام ودەزگاکانی، مەسەلەی داوێن پیسی وسوکایەتکردن بووە بە نامووس وئابڕوی خێزان وکەس وکاری نەیارانیانەوە .

ئابڕو بردنی کچە پاکیزەکانی دەوڵەتی کویت ومەسیحیەکانیعیراق وکچان وژنانی کورد لە (٣٥)ساڵی ڕابردووی حوکمڕانی ئەو ڕژێمەدا نمونەی هەرە

زینـدووی ئـەم ڕاسـتیەن. بیگومانـسەرانی بـەعس بێگوێدانـە سـەرەتاپترین مافـەکانی مـرۆڤ وهـەموو یاسـاو ڕیـساکان ، زۆر بـێ ویژدانانـە وبـێ ئـەوەی تۆزقاڵیك شەرم بیانگرێت ،لە چەندین قۆناغی جیاجیـادا هاوشـانی سیاسـەتی کوشتن وبڕین وکاولکاری وکارەسات ، چەندین ڕەفتاری نامرۆڤانـەیان ئـەنجام داوە .زیندانـەکانی بـەعس ونمونـەکانی سـی وپێـنج سـاڵی ڕابـردوو گـەواهی مردوویێتی ویژدانی سەدام وجەلادەکانیانن.

ڕۆژانی کارەساتی شومی ئـەنفال وزانیـاری شـایەتحاڵەکانی نێـو ئـەو دۆزەخـە ،چـەندین بەسـەرهات ونمونـەمان بـۆ دەگێڕنـەوە کـە تێـدا جـەلادە بـێ ئابڕووەکـانی بـەعس چۆن وەکـو ئـاژەڵ بـەر دەبنـە گیـانی پـاکی ژن وکـچی پاکیزەی کورد لە نێو گرتوخانەکانی (تۆپزاوا ،دەبس،نوگرە سەلمان…هتد).

دیـــارە کاربەدەســـتانی ئـــەو ڕژێمـــە بـــێ ئـــابڕووە بەوەیـــشەوە نەوەســـتاونەتەوە،بەڵکو چـــەندین پۆلـــە کـــچی پـــاکیزەی کوردیـــان بەوڵاتانیعەرەبی فرۆشتووە ، یان بە دیاری بۆیانی ڕەوانە کـردووە کـە بێشك ئەوانیش بەمەمنونیەوە ئەو دیاریەیان قبووڵ کردووە ئا ئەمەش وا لـە مرۆڤـی کورد دەکات کە یەك ڕاستی هەیە خوی لێ گێل نەکات ئەویش ئەوەیە (سـەدام وبەعـسوکلتورویاسای دوورگـەی عـەرەبی)تـەواو کـەری یـەکترن ، بـۆ ئـەم ڕاستیەش ئەگەر بەنێو دوو توێ لاپەڕەکانی میژوودا شـۆڕببینەوە وبـەراوردیك بکەین ڕێك ئەو ڕاستیەی سەرەوەمان بە چاکی بۆ ڕوون دەبێتەوە .

چونکە کاتیك بەعس نزیکەی (١٨) کچ و ژنی کورد بـە جاریـك دەکاتـە دیـاری وپێشکەش بە (مەلهاکان) ویانەکانیشەوی دەکات لە ولاتی (مـصر) . وەڵێ لـە بەرانبەریشدا ئەوانیش بە سوپاسەوە قبووڵی دەکەن ، باشە ئەمە ئەگـەر ئـەو ڕاستیەی سەرەوە نەبێت ، ئیتر دەبێت چی بێت .

ئەوانەی کە لە زیندانەکانی بە عس دوای چەندین مانگ زیندانی ئازادبوون ،باس لە چەندین بە سەرهاتی ئابڕووبردنی کچ وژنی کورد دەکەن لە نێو دۆزەخە تاریکەکاندا بە دەستی جەلاد ە دڵڕەق وبێ شەرمەکانی بەعس ،دیارە سەرانی ئەم ڕژێمە بەوەشەوە نەوەستانەوە ، بەڵکو پرۆسەی فرۆشتنی کچان وژنانیشی پەیڕەو کرد بۆ ولاتانی دەورووبەر .

ئەوەتا بەپێ نوسراوی ژمارە (١٦٠١)ی ڕۆژی ١٩٨٩/١٢/١٠دەزگای موخابەراتی عیراق زۆر بە ڕوونی ئاماژە بۆ ناردنی پۆلیك کچ وژنی کورد دەکات کە ژمارەیان (١٨)کەسە بۆ مەلها ویانەکانی شەو لە ولا تی میسر . کە نمونەی هەرە زیندووی بێ شەرمی ودڕندەیی وبێ ویژدانی ئەو ڕژیمە وکاربەدەستانی دەگەێینی لە بەرانبەر مافی مرۆڤ وسەرجەم یاساکاندا .

جا بۆ زیاتر نزیك بوونەوە وئاشنا بوون بە ڕاستی ودروستی ئەم مەسەلەیە ، چوینە لای هەندیك لە کەس وکاری ئەو کچ و ژنانەی کە ناویان لە بەڵگە نامەکەدا هاتووە وهەموشیان خەڵکی نەوجولن لە دەڤەری گەرمیان .



سەرەتا کاك کەماڵ حوسین هەمزە

سەبارەت بەم مەسەلەیە بۆمان ددواو وتی( من کۆمەڵێك خزم وکەس وکـارم لـە ئەنفالـدا بـێ سـەر وشـوێن کـران. ئـیتر لەوسـاوە هـیچ هـەواڵیکیان نـازانین . دوای پرۆسـەی ئـازادی ڕۆژێـك ڕۆژنـامەی کوردستانی نوێ کەوتە دەستم ، کاتیك تەماشـام کـرد ، هـەواڵ فرۆشـتنی کـۆمـەڵێك کـچ وژنـی کـوردی تێـدا بـڵاوبۆتـەوە کـەفرۆشراونەتە میـسر، پاشـان بەدیقەتـەوە سـەیری ناوەکـانم کـرد ،تەماشـامکرد هـەموویان خـەڵکی دێکـەی ئێمـەن وزۆربـەیان خزمی نزیکمانن، بەپەلە جەریدەکەم برد بۆ بارەگای حیزبی شـوعی لەوێ هاوڕییان تەماشایان کرد و هەموویانمان ناسی. بەڕاستی

هەواڵیکی ناخۆش بوو ، وامانزانی ئێستا ئەو ڕۆژەیە کە کەس وکارەکەمان ئەنفال بوون...) .

پاشان کاك عەبدولخالق قادر عەزیز ، کە خـەڵکی نەوجولـە، یـەکیك لـە وانـەی ناوی لە بەڵگە نامەکەدا هاتووە خوشکی ناوبراوە ، بـۆیی ووتـی(ڕۆژی هـەینی بوو ،کاتژمێر ٦ی ئێوارە لە گەڵ کۆمـەڵێك لـە هاوڕییانـدا لـە بارەگـای حیزبـی شوعی لە شاری خورماتوو بووین ،لە پڕا هاوڕێ کەمال حوسێن هاتـە ژوورەوە تەماشامان کرد ڕۆژنامەیەکی کوردسـتانی نـوێ پێیـە ، ڕوخـساری تاڕادەیـەك شێواو بوو. بە شڵژانەوە بۆمان دوواو وتی : تەماشا کەن ئەمە نـاوی کۆمـەڵێك کچی ناوچەکەی خۆمانە هەموویان فرۆشراون بە وڵاتی میسر. کاتیـك سـەیری ڕۆژنامەکەمان کرد وناوەکانمان لە نێو بەڵگەنامەکـەدا بینـی بەتایبـەتی کاتیـك

ناوی (عیسمەت) خوشکم بینی ، ئیتر خەم وپەژارە دایگرتمی ولە داخدا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە چووم بۆ ناو بازاڕ شارەکە ، نوسخەیەکم لێ کۆپی کرد وچوومەوە ملەوە ، جاریکتر زامەکانمان کولایەوە، بەڵام هیچیشم پێ ناکرێت ، بۆیە داوا دەکەم لە دەسەڵاتدارنیکورد وهەموو ڕێکخراوەکان هەوڵێك بدەن بۆ دۆزینەوەیان...).

هەر لەم چوا چێوەیەدا چووینە لای



کاك ( بەشارات ئەمین هەمزە)

وئەویش بەم شێوەیە بۆمان دواو ووتی (ئێمە خزم وکەس وکاریکی زۆرمان ئەنفالە، هەر خزمی خۆم نزیکەی (١٤)کەسمان بێ سەر وشوێنە وهیچ هەواڵیکیان نازانین ، ڕۆژێکیان کەماڵ ئامۆزام جەریدەیەکی هاورد بۆم ووتی ئەوە ناوی هەندیك لە کەس وکارەکەمان وبەعس فرۆشتێتی میسر ، کاتیك سەیرم کرد ناوی هەژدە کچ وژنی دێکەمانی تێدایە ، لە ناویاندا ناوی (حەسیبەی)ی خوشکم و هەردوو کچەکەی تێدایە ، لە گەڵ چەند خزمیکی ترماندا ، خۆزگایە قەت ئەم هەواڵەم نەبیسایە، جایکی تر زامەکانمان کولایەوە .هیچ دەسەڵاتیکمان نیە هەر ئەوەندە دواکارین سەدام ودارو

دەستەکەی بڕێنە دادگا و بە سزای عادیلانەی خۆیان بگەیێن ،داواکارین لە حوکمەتی کوردی سۆراخی ئەو هەچدە کچەش بکات...) .

ئەم تاوانەی سەرەوە یەکیکە لە هەرە تاوانە قێزەونەکانی ڕژێمی فاشی بەغدا ، کە لە سەردەمی مەرگەساتی ئەنفالدا دەرهەق بە پیرۆزیەکانی گەلی کورد ئەنجامی داوە . بێگومان ئەم ڕەفتارە نیشانەی ئەوپەڕی دڕندەیی وبێ شەرمی بەعس وپەروەردەی کلتوری دوورگەی لم دەگەیێنی لە مێژوودا .

**بیرەوەری چەند شایەتحاڵێک ........**

دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ بە سەر مەرگەساتی شومی ئەنفال دا ، تا هەنووکە پاشماوەکان وئەوانەی کە لە مەرگ گەڕانەوە بە دەم بیرەوەریە تاڵەکانی ڕۆژانی ئەنفالەوە دەتلێنەوە .

دەتوانین بێژین هەموو ڕۆژێک ئەنفال خۆی دووبارە دەکاتەوە ، چونکە کاریگەری خراپی ئەو کارەساتە ودیمەن ووێنە پڕ لە تراژیدیاکانی هەمیشە لە بیرو هۆشی ژن ومنداڵ وپیروپەککەوتەی دەرباز بوو لە دۆزەخە ، یەکسەر دەیانباتەوە نێو دونیای پڕ لە سام وکارەساتباراوی ڕۆژانی ڕەشی ئەنفال ، هەر یەکە لەو پاشماوانە وبەتایبەتی ئەوانەی کە بە سجنی برانە کامپەکانی (تۆپزاوا ،قۆرەتوو،تکریت،دەبس ،نوگرە سەلمان...هتد) وچەندین مانگ بەدیلیو ژێردەستەیی لە نێو هۆبەو زیندانە تاریکەکانی بەعسدا مانەوە ،ئەمڕۆ بۆ خۆیان هەڵگری کۆمەڵێک چیرۆکی کارەساتباراوین ، کە ڕەنگە ئەوەی ئەم ڕژێمە وسەرۆکەکەی وەکو خۆی نەناسیت ،ئاسان نەبێت بڕوا بەم ڕەفتارە دزێوانەی جەلادەکانی ئەم تاقمە بکات . کە چۆن تێدا مرۆڤی بێ گوناهی کورد بە دڕندەترین شێوە ئازار وئەشکەنجەی جەستەیی ودەروونی دەدرێن .

کاتیک بتەوێت کەسیکی لەو چەشنە بدوێنی ، مەحاڵە تۆیش بەدەم گێڕانەوەی دیمەنەکانی ئەو ڕۆژانەوە خەیاڵ نەتباتەوە نێز مانگی چواری ساڵی ١٩٨٨، ئەو ساڵەی کە کورد تەنانەت شاخ ودۆڵ وئەشکەوتەکانی کوردستانیش پەنای نەدا . ئێستاش زۆرن ئەو پیاو ژن ومێردمنداڵانەی ، کە ئەوێ ڕۆژێك بە زەحمەت لە چنگی مەرگ دەربازبون یان دوای چەندین مانگ زیندانی ئازاد کران ، هەر یەکێك لەوانە هەنوکە خاوەنی چەندین چیرۆکی واقعین کە باس لە ئازار و ئەشکەنجەوهەتککردنی ناموسی کورد دەکەن، بەدەست جەلادەکانی بەعس وبیانانی لمەوە .

بۆیە وەك نمونەگەلیك کۆمەڵێك لەو کەسانەمان هێنایە گفتو گۆ بۆ گێڕانەوەی دیمەن و چیرۆکە ترسناکەکانی نێو زیندانەکانی ڕژێمی بەعسی ڕۆخاو .

حوسێن وەلی عەبدولڕەحمان ،لە دایکبووی ساڵی١٩٧٤،گوندی وارانی



پێشتر ئاگادار بووین کە ڕژێم هێزێکی گەورەی لە دەوروبەری دووز و نەوجول کۆ کردۆتەوە ، بەچەند ڕۆژێك پێش پەلاماری سوپا بۆ سەردێکانی داوێ ، ئێمە چەند ماڵێك بە خاو خێزانەوە کەوتینە ڕێی بەلای کەلاردا ، سەرەتا چووینە ملە سووورە ، دواتر بەرەو ئۆردوگای سمود ڕۆیشتین لەوێ جاشە خۆفرۆشەکان دەستگیرمانیان کرد ، ئەوانیش ڕەوانەی (قۆرەتوو) مانیان کرد

مـاوەی (١١)ڕۆژ لـەوێ ماینەوە ، ژمـارەمان نزیك (٤)هەزار ژن ومندالّ وپیاو دەبوین ، پاشان ڕەوانـەی تـۆپزاوا کراین لە نزیك کەرکوك . بە بیرمە سێ ڕۆژ مـاینەوە، ئینجا ژن ومـندالّیان لـە پـیاوەکان جـیا کردەوە ، ئێمەیـان برد بۆ دەبس . بۆ ماوەی (٦) مانگ مـاینەوە ،لەوێشەوە بۆ دواجـار ڕەوانەی سجنی (نوگرە سـەلمان ) کراین ، کە ئەکەوێتە نزیك سعودیەوە ، زیاتر لە (٨) گانگێکیش لەوێ ماینەوە ، ژیانیکی هێجگار ناخۆش وناڕەحەتمان دەبردە سەر، ڕۆژانە چەندین کەسمان لێ دەمرد ودەبووە خۆراکی سـەگە ڕەش،جـەلادەکان زولّمی زۆریان دەکرد، تەعدای ناموسیان لە کچ وژنەکان دەکرد وهیچ دەسـەلاتێکمان نەبوو ، بەتایبەتی زولّم وغەدرەکانی حەجاج وشەوقی لە ڕادەبەدەر بوو ، ئـەو ماوەیەیی سجنە خۆم وخێزانەکەمان پێکەوە بوین وژمارەمان (٦) کەس بوو.

حوسێن عاسی کەریم ، لە دایك بووی سالّی ١٩٧٧،گوندی وارانی



ناوبـــراو لە خێزانیکی (٩) کەسی تەنها خۆی دوای چەندین مانگ زیندانی لە دۆزەخی ئەنفال ڕزگاری بووە. لە هەموو بنەمالّەکەیشی نزیکـەی (٣٦) کـەس لە پیاو وژن وندالیان لەو شالاوەدا نێ سەر وشوێن کران.

حـــوسێن لـە سـالّی ١٩٨٨مێردمـــندالّ بـووە، بـەلام هـــەموو دیمـەن وێنـە ناخۆشـەکانی ئـەنفالی وەکـو خـوی لـە یـادە ، وەك خـۆی باسـی

دەکات ودەڵێت ( بەڕیکەوت من میوانیماڵی خاڵۆم بووم لە دێیە نزیک دێکەی خۆمان ، کاتیکیش جاش وجەیش هێرشیان بۆ سەر ناوچەی داوێ دەست پێکرد ، بەناچاری لە گەڵ ماڵ خاڵۆمدا بە تراکتۆر بەڕیکەوتین بۆ دەوروبەری کەلار، لە ملە سووره تەسلیم بەهێزەکانی ڕژیم بووین ، سێ ڕۆژ ماینەوە وئیتر ڕەوانەی (قۆرەتوو) کراین لەو بەر سیروان ، لەوێشنزیکەی سێ ڕۆژی تر ماینەوە، پاشان بە ئیفای عەسکەری بەرێ کراین وبۆ ماوەیشەو ڕۆژێك بەڕێگاوە بووین، کە نانەمانزانی بۆ کوێ دەمان بەن ، لە پڕا بێ ئەوەی لە هیچ شوێنێك دامانبەزێنن بۆ جاریکی تر گەڕانمانیانەوە بۆ سجنەکەی قۆرەتوو ، لەوێشەوە خراینە ڕێ بۆ سجنی تۆپزاوا لە نزیك شاری کەرکوك ، دوای سێ ڕۆژ ، بە لێدان کوتنە وێزەمان وبە بیانوی جیاجیا ژن ومنداڵ ومێردمنداڵیان لە پیاوان جیا کردەوە ، ئێمەیان .

نارد بۆ سجنێکی تر لە نزیك (دەبس)لەو ڕۆژە بەدواوە پیاوە گەنجەکانمان نەبینیەوە ، بۆ ماوەی (٤) مانگ لە دەبس ماینەوە .لە ڕاستیدا ناو ئەو سجنانە بۆ ئێمە کارەسات بوو ، ئەوەندە زوڵم وڕەفتاری ناشرینم لە پیاوە خوێنرێژەکانی بەعس بینیوە هەرچەندە بسی بکەم

هەر تەواو نابیت ، ئەوان سڵیان لە هیچ نەئەکردەوە ،دەستدرێژیان ئەکردەسەر ناموسی کچ وژنە گەنجەکان ، ڕۆژانە لە ژێر تەعزیب و لێداندا چەندین کەس دەمردن ، ڕۆژێك ژنیکی ناوچەی داوێ زۆرپاڕایەوە لە جەلادەکان کە نەیبەنە دەرەوە ، ئەویش بە کێبڵ زۆری لە ژنەکە داو پێ دەوت (الله مجان) . بڕوا بکە کە باسی ئەو سجنە دەکەم ، بەتەواوەتی ژیانم لێ بێزار دەبێت ، هەتا مردن ئەو کارەساتەم لە بیرناچێتەوە ...).

ووتی(بچۆ لای جەلال تاڵەبانی جنسێکەت بێنە ...) لە تکریتیش بۆ ماوەی (١٠)ڕۆژماینەوە و ئینجا بردمانیان بۆ چەمچەماڵ ولەوێ ئازاد مانیان کردوتاکو ئێستا کوڕیکم بەناوی (وەلی ) بێ سەرو شوێنە ...).

لافاو نوری سەتار ، لە دایك بووی ساڵی ١٩٦٤ گوندی ئاوباریك



پێش ئەنفال ئێمە ژیانمان لە سەر ئاژەڵداری وجوتیاری بوو ، بەڵام زۆر ڕازیی بووین لە سەر ئەو ژیانە ، هەر کە هەواڵی ئەوەمان پێ گەیشت کە بەعس بەنیازە هەموو کوردستان ویران بکات ، ئیتر ترسمان لێ نیشت ناچار بەر لەوەی جاش وجەیش بگاتە بنارەکە بە خێزانەوە لە گەڵ خەڵکی ئاوایەکەماندا لە ناو هەردەی زەنگەنەوە کەوتینە ڕێ بەرەو قادرکەرەم ، دوو سێ ڕۆژماینەوە ، پاشان بە ناچاری تەسلیم بە بەعسیەکان بووینەوە ، ئەوانیش بە ئیڤای عەسکەری گۆاستمانیانەوە بۆ چەمچەماڵ، لە ویشەوە بۆ کەرکوك و پاشان براینە سجنەکەی تۆپزاوا ، وەزعمان زۆر خراپ بوو بە دەست عەسکەرو حەرەسی سجنەکەوە ، ئەوەی خۆا حەزی لێ نەکردایە ئەوان بەرانبەرمان دەیانکرد ، بە یەك چاو سەیری منالّ وژن وپیرو پەککەوتەیان دەکرد ، تۆزقاڵیك بەزەییان بە کەسدا نەئەهات ، ڕۆژێك بە لێدان بریکمانیان

ڕەنگین ئەمین قادر ، لە دایك بووی ساڵی١٩٥١،گوندی ئاوباریك



پێش ئەنفال ئێمە لە دێی ئاوباریك بووین لە بناری گل ، سەرقاڵی ژیانی ڕۆژانەی خۆمان بووین ، ڕاستە ناوە ناوە تەیارە وفڕۆکە دەهاتە سەرمان وقەسف وبۆردوومانی ناوچەکەمان دەکرا ، بەڵام قـــەت بـیرمـــان لە وە نەئەکردەوە ڕۆژی لـــە ڕۆژان بـــەم

شێوە سەرگەردان وماڵ وێرانمان بکات ،وە چـــەند ڕۆژێك بـــەر لە هاتنی جاش وجەیش بۆ نـــاوچەکەمـــان ، بە خـــێزانەوە ڕوومـان کردە ناحیەی قادرکەرەم ، بە فیتی جـاشە خـۆفرۆشەکان و لـــە فەقیری ونەزانی خۆمان تەسلیم بە بەعس کرد ، ئێمە ڕیـك خێزان بـووین بـــە چۆار ئیڤای عەسکەری ڕەوانـــەی چەمچەماڵ کراین ، لەوێشەوە بۆ کەرکوك ئینجا سەیارەی موقەپەتیان هێنا وبراین بـــۆ سجنەکەی تـــۆپزاوا، لەوێ ڕەفتاری بـــەعسیەکان لە گەڵماندا زۆر خراپ بوو ، بەتایبەتی ئەو ڕۆژەی کە ڕەوانەی تکریت کراین بە کێبڵ ودار زۆریان لێمان دا لەو کاتەدا کە بارمانیان کـــرد من جنسیەکەم لە ناو سجنەکەدا بەجیهێشت بوو ، زۆر لە جەلادەکان پاڕامەوە تاکو ڕێـــم بدەن بچم بیهێنم ، یەکـێك لـــە جـــەلادەکان زۆری لێ دام

جیا کردەوە وڕەوانەی دەبس کراین وچەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە وئینجا ڕەوانـەی سجنێکی تر کراین لە نزیك شـاری تکـریت ، دوای (١٠) ڕۆژ عـازاب وبرسێتی وکوشتن وبڕین ئێمەیان گواستەوە بۆ چەمچەماڵ لە وێ وەك شتیکی سـەیر ئێمەیان ئازاد کرد ، ئێستایش برۆاناکەم ئێمەیان چۆن ئازاد کرد . ئێستا خـۆم و کـوڕێکم لە شـاری خورماتووی ژیانی کوولە مەرگی دەبەینە سەر....).

مەجید قادر هەمزە ، لە دایك بووی ساڵی ١٩٢٦، شاری خورماتوو



بە ماوەیەك زۆر بەر لە ئەنفال من ماڵم هاتبووە شاری خورماتووی ، لە گەڕەکی جمـوری دائەنیشتین ،کە ئەنفال دەستی پێکرد بۆ سەر ناوچەی داوێ وگەرمیان ، چەند خێزانیکی خزمان کە خەڵکی دێی تاڵاون لە مـاڵ ئێمەدا خۆیان قایم کـردبوو هێشتا بە تـەواوەتی تـەپوتۆزی ئەنفال نەنیشتبووە ، ڕۆژیکیان جەیش وجـاش وئەمن
شـارەکەیان تەوقکرد و حەملەیەك زۆر گەورەیان کرد لە ناو شارەکە دا بەمەبەستی دەستگیر کـردنی ئەوانەی کـە لە ئەنفال خـــۆیان شاردبۆوە ، کاتیك حەملەکە گەیشت ماڵ ئێمە ودوای گەران هەموو ئەوانەی کە لە ماڵمندا خۆیان قلیم کردبوو ، هەموویان گیران و ئیتر

منیشیان وەکو خاوەن ماڵ دەستگیر کرد بە تۆمەتی ئەوەی پاشماوەی ئەنفالم لە مــاڵە کەی خۆمدا شاردۆتەوە ، بــەسەیارەی مــەدەنی و عەسکەری گواسترابینەوە بۆ بۆسجنیك لە نزیك تکریت ، لــە ویێ ماوەی (٤٥) ڕۆژ مامەوە . هەر لەویێ بەبەر چاو ئێمەوە ژن وکەنجە کانیان لە پیاوەکان جیاکردەوە . ژیانیکی تاڵ وهێجگار نــاخۆشمان بــردە سەر زۆڵم وتەعدای زۆریان دەکرد ، ئــەوانەی کە لە خــورماتووی گیراین ژمارەمان تەقریبن (٧٠٠)کەس دەبووین ، کە ژمارەیەکی وەکو من تەنها گوناهمان ئەوە بوو پاشماوەی ئەنفال کراوەکانمان لە ماڵەکانماندا شاردبووەوە، پاشان من وهەندیك کەسیتر بەڕەزالەت نەجاتمان بوو....).

عەزیز کاکە خان وەلی ،لە دایك بووی ساڵی ١٩٣٢، گوندی تالاو



من وخەلیل تالاوی برام (٣)یێ مــانگ پێش ئەنفال لە لایەن بەعسەوە لە نزیك دێی خــدروەلی گیراین وڕەوانەی ناو وەحدە عەسکەریەکانی دەوروبەری خورماتوو کراین. پاشان بردمانیان بۆ دائیرەی ئیتزباتی عەســکەری لە کــەرکوك ، دوای پێنج ڕۆژ سجنی گوازرابینەوە بۆ تکــریت ، سێمانگ ماینەوەوکە ئەنفالەکە هات بە سەر دا ئیتر ئێمە یانیش لــە گەڵ ئەواندا ڕەوانەی سجنی نوگرە سەلمان کرد لە خوارووی عیراق ، لەم شوێنە ڕۆژانە چەندین کەسمان لێ دەمرد، لە گشتیشی ناخۆشتر

بەزمی سەگە ڕەش بوو ، هەرچی ئەمری خۆای بکردایە  بە دوو سێ کەس دەمانبردو لە چێر تۆزێك لم دا دەمانشاردەوە ، دوای ئێمەش دەبـــووە خـــۆراكی سەگە ڕەش زۆر شتی نـــاخـــۆشمان دەبینی بەلام هیچ دەســـەلاتیکمان نـــەبوو ، خـــەلکی زۆر لە دێکەی ئێمە ئەنفال بوون وابزانم نزیکەی (١٠٢) کەس دەبێت لەژن و منداڵ و گەنج و پیرو پەککەوتە وخۆمیش کوڕێکم بێ سەرو شوێن کرا ....).

مەتریفە ئەحمەد سادق ، لەدایك بووی ساڵی  ١٩٥٦، گوندی تالاو



ئێمە لە دێکەی خۆماندا خۆشترین ژیانمان دەبردە سەر، هەر یەکەو خەریك کارو کاسبی خۆی بو قەت ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرمان لەوە نەئەکردەوە کە وامان بە سەردا بێت ، نەماڵ ما نە کەس وکارمان ما ، هەر کە سوپای سەدام پـەلاماری ناوچـەکەمـانی دا ئیتر هیچ دەرفەتیك نەما بۆ ڕگاربوونمان لە دەست جاش وجەیش، بەزیل عەسکەری هێنامانیانە

ناحیەی نەوجول لەوێشەوە براینە مەرکەز شەبابەکەی دووز ،خەلکی

زۆری داوێ وبناری گلیان لەوێ کۆکردبووە کە ژن ومناڵ بوون .چەند ڕۆژێك ماینەوە ، پاشان گوازرراینەوە بۆ سجنیکی تر لە نزیك تکریت، ماوەی (٣)ای مانگ ماینەوە ، هەر لێرە کچە عازەب وپیاوەکانیان لە ئێمە جیاکردەوە وبە تەواوەتی لە یەکتر دابڕاین ، ژیانیکی زۆر ناخۆش وپڕ لە مردن وبرسێتیمان بردە سەر ، بەر لەوەی پیاوەکانمان لێ جیا بکەنەوە چەند جاریك بە بەر چاومانەوە پیاوەکانیان دەبر بۆ تەعزیب وئەشکەنجە دان ، کە جیاش کرانەوە ئیتر لە دڵ خۆمانەوە ووتمان پیاوەکانیان بۆ کوشتن برد ، بەهەرحاڵ ڕۆژێك خرمانیان وبە سەیارەی موقەپەت بردمانیان بۆ نوگرە سەلمان ، شوێنیکی زور قەبیح وناخۆش بوو ، ڕۆژانە دەیان ژن وپیاو منداڵ لە برسێتی ونەخۆشیدا دەمردن و دوّاتر دەبوونە خۆراکی سەگە ڕەش ، کورە نازانم باس حەجاج بکەم یان باس سەگەڕەش بکەم...)



عوسمان ڕەفیق خدر ، گوندی گۆلباخ

کەس بڕوای نەئەکرد ڕۆژێك بێت وئێمە واسەرگەران وماڵ وێران بین ، باشترین ژیانم بوو لە دێکەی خۆماندا ، کاتیکیش جاشە خۆفروش وجەیش گەیشتە ناوچەی زەنگەنە تەڕو وشکی بە یەکەوە سوتاند ، نەماڵ مانە خێزان ما هەمووی ئەنفال کران ، بەشێ زۆری گەنج وپیاوەکان بێ سەر وشوێن کران وتاکو ئێستایش بە تەواوەتی چارەنووسیان نازانین ، من بە ناچاری تەسلیم بە ڕژیم بوومەوە، سەرەتا براین

بـۆ چەمــچەماڵ ولەوێــشەوە ڕەوانــەی تــۆپزاوا کــراین کــە خــەڵکێکی زۆر بــووین ، پــاش چــەند ڕۆژێــك ئــیتر بــەڕێ خــراین بــۆ دۆزەخەکــەی نــوگرە ســەلمان ، چــەند هــەزار کەســیك دەبــووین ،بــە زۆری ژن و منــداڵ بــوو ، ڕۆژ نەبوو لە نەخۆشیدا یان لە برسیا چەند کەسیکمان لێ نــەمریت ، ئــەنجام ئــەبووە خۆراکی سەگ ڕەش. من دوای شەش مانگ سجنی بــەربووم وتــامردن کارەساتی ئەنفال ونوگرە سەلمانم لە بیر ناچێتەوە٠٠٠٠).

سەعدە ڕەشید حەسەن،لە دایك بووی‌ساڵی١٩٥١،گوندە تالاو



هەر لە گەڵ دەست پێکردنی ئەنفالدا ، یەکسەر ئێمە بەخێزانەوە ڕوومان کرد قادرکەرەم ، لەوێ کوتینە چنگی جاش وجەیشەوە وڕەوانەی‌شاری خورماتوی کراین ، هەر کە گەیشتینە ناو شار سائیقەکە سەد جار ماڵی ئاوا بێت ووتی دابەزن وبڕۆن لە ناو شاردا خۆتان قایم بکەن ، ئێمەیش چووین لە ماڵ خزمیکماندا خۆمان شــاردەوە ، بــەلام بەعس پێمانی زانی وجاریکی تــر کەوتینەوە دەستیان ، ئینجا بۆ تکریت بردمــانیان . مــاوەی مانگ ونیوێك هەر لە تکریت ماینەوە، ئەمجارە گۆاستمانیانەوە بۆ تۆپزاوا ، لــەوێ کــوڕەکەم کە ناوی

(وەهاب) بوو لێمان جیا کرایەوە ، بەیانیانیک بە لێدان کەوتنە وێزەمان وبە سەیارە ڕەوانەی دەبس کراین ، لەوێش مانگ ونیوێکی تر ماینەوە ، خەڵکێکی زۆر لەو سجنەدا کۆکرابوینەوە ، ئەو سجنە بریتی بوو لە پێنج قاعەی گەورە ، تێدا ئازارو ئەشکەنجەی جۆراو جۆر دەدراین ، تەنانەت ڕۆژێکیان ژنێك هەر لە ترسدا مرد ،تا بڵێت سجنێکی ناخۆش بوو ، ڕۆژێکیان لە پڕا جەلادەکان هاتنە ژوورەوە ووتیان یاڵا حکومەت عافوی داوە ، کەسمان بڕوامان نەئەکرد جارێکی تردونیا ببینین ، ئیتر براینە سلێمانی وهەر لەوێ ئازاد کراین ٠٠٠٠).

حەبیبە مەجید زاهیر،لە دایك بووساڵی١٩٢٧،گوندیهەیەرەسوور



من خەڵکی دێی هەیەرەسوورم ، کاتێ جاش وجەیش و تەیارە پەلاماری داوێیان دا ، ئیتر هەر کەسەو کەوتە فریای ماڵ و خێزانەکەی تاکو خۆی لەم لافاوە لابدات، بۆ ماوەیەك کەم لە دەورووبەری دێکەی خۆمان قایم کرد ، لە ڕلستیدا نەئەمانزانی بەرەو چی لایەك بچین ، لە گشت لاوە ئاگر باران بوو . ناچار

خۆمان دا بە دەست جاشەوە ، بە ئیڤای عەسکەری هەموومانیان بەرەو دووز برد ، بردمانیانە مەرکەز شورتە ، ئیتر گوازراینەوە بۆ تکریت،ماوەی یەك هەفتە ماینەوە ، هەر لەوێ ژن وپیاویان لە یەکتر جیاکردەوە ، ئیتر چارەنووس پیاوەکانمان نەزانی وئێمەیانیش برد بۆ نوگرە سەلمان ، وابزانم بۆ ماوەی (٧) مانگ ماینەوە ، ژیانەکەمان هێجگار ڕەزالەت بو، نە خۆارنیان ئەدا ن دەواو عیلاجیان ئەدا .خەلکیك زۆر دەمردن ڕۆژێك ژنیك کە خەڵکی داوێ بوو لە ناو سجنەکەدا ئەمری خۆای کرد ،ئێمەش بەناچاری بە جل وبەرگەکانی خۆیەوە لە ژێر هەنیك فومدا لاشەکەیمان شاردەوە، بۆ بەیانییەکەی سەیرمان کرد دەست وقاچی ها بە دەم سە گە ڕەشەوە ، ،باس ئەم کاول بووە قەت تەواو نابێت....) .

پیرۆز حوسێن عەزیز،لەدایك بووی ساڵی١٩٧٦،گوندی هەیەرەسوور



سەرەتا ئێمە کۆمەڵێك خێزان بوین ، جاش وجەیش بە سەیارە بردمانیان بۆ خورماتووی ، لەوێشەوە بە ڕێی کراین بۆ سجنیك لە نزیك تکریت،نزیکەی یەك هەفتە ماینەوە وەزعمان زۆر خراپ بو ، ڕۆژانە تەنها سێ سەموون ڕەقیان پێمان دەدا , زۆر تەعدایان لێمان ئەکرد بەزەییان بە کەسدا نەئەهاتەوە . ئەو ڕۆژەی ژن و پیاویان لە یەکتر جیاکردەوە منیانیش خستە ناو گەنجەکانەوە ، بەلام فرسەتم سەندو گەڕامەوە لای دایکم ،

یەکیك لە جەلادەکان پێمی زانی وهاتەگیانم و زۆری لێ دام ، ئیتر منالّ ومێردمنالّ وژنەکان وپیروپەککەوتەکانیان گۆاستەوە بۆ نوگرە سەلمان ، لەوێش بۆ ماوەی حەوت مانگیك ماینەوەو پاشان بەربووین ٠٠٠٠).

## نوگرە سەلمان دۆزەخیك بۆ گەرمیانیەکان

نوگرە سەلمان ناحیەیەکە لە خوارووی عیراق ،لە رووی ئیداریەوە سەر بەپاریزگای(سەماوە)یە . کە دەکەویتە نزیك تخوبی عەرەبستانی سعودیەوە . بەتەنیشت ئەم ناحیەوە گرتووخانەیەکی کۆن وگەورە هەیە ،کە لەچەشنی قەلا دروستکراوە. ئەم بینایە لەلایەن زۆربەی دەسەلاتدارانی بەغداوە بە کارهێنراوە بۆ زیندانیکردنی ئەندام ولاینگرانی نەیارانیان بە تایبەتیش بۆ کورد .

بەلاملە سەردەمیبەعسیە شۆفینیەکاندا ، بوبووە جێگایەك بۆ کوشتنی ژیان ولە ناو بردنی مرۆڤی بێ تاوان .بەکورتیبوبووە دۆزەخیك کە تیدا هەزاران ئینسانی کورد بەناشرینترین شێوە بە مەرگی ناچاری دەسپێردران ، کە جگە لە میتۆدی بەعسیە ئەفلەقیەکان ،هیچ یاساو رێسایەکی تر قبوولّی نەدەکرد.

نوگرە سەلمان چ وەك هەلّکەوتەی جوگرافی وچ وەکلتوروچ وەك ژینگە وچ وەك کارئەکتەرەکان لە نێو دیمەنە ترسناکەکاندا،دەمانگەرێنیتەوە نێو مێژوویەکی دوور تر لە ئێستا

که هەنوکە خوی لە هەمان واقعدا ولە هەمان ژینگەدا دووبارە دەکاتەوە . پێم وایە وێنە کانی نێو ئەم دۆزەخە تەنها گوزارشت لە کلتوری بەعس وەکو حیزبیك ناکات ، بەڵکو گوزارشت لە کلتوری بیابان ودورگەیعەرەبیش دەکات . چونکە ویژدانە مردووەکەی (حەجاج)و (شوقی)و (موقەدەم حەسەن) ئەو پەڕی نموونەی مردوویێتی ویژدانی ئینسان وکلتوری بیابانن ، ئەگەرنا چۆن دەبیت بەو چەشنە سوکایەتی بە بەندە بێتاوانەکانی خوداوە بکرێت .

دۆزەخی نوگرە سەلمان بۆ کورد نیشانەی ئەوپەڕی مەزڵۆمێتی گەلیکە، وەلێ بۆ میژوو وکلتوری بیابانیش نمونەی ئەوپەڕی دڕندەیی وشەرمەزارییە . بەر لە پەلاماری ئەنفال بۆ

سەرکوردستان ئەم ناوە شومە ونەگریسە لای نەوەی نویێ کورد کەمتر ناسرابوو ، هەرچەندە لە سەردەمەکانی ڕابرووداا بەهەمان شێوە کورد بەدیلی وزەلیلی دەبرایە نێو ئەو دۆزەخەوە ، بەڵام تاکو ئەنفال وەکو خوی نوگرە سەلمانمان نەناسیبوو ، ئەو شوێنەی کە بووە جێگای مەرگەسات بۆ ژن ومنداڵ وپیاویکورد .

چیرۆك ودیمەنە تراژیدیاکانی نیو ئەم گرتوخانەیە ، کە کارئەکتەرە سەرەکییەکانی بە زۆری هەریەك لە (حەجاج ، شەوقی ، موقەدەم حەسەن ، سەگەڕەش.....هتد) بوون ، جێگای ئەستەمە کورد تا دونیا مابێت لە بیریان بکات .

جا بۆ ئەوەی دونیای پڕ لەمەرگەساتی نوگرە سەلمان وەکو خۆی بناسین ، باشتر وایە چەند شایەتحاڵیك بهێنینە گفتو گۆ :

هاولاتی (حوسین وەلی) بۆمان دووت وتی (لە ڕاستیدا نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم وباسی کام تاوانی ناو نوگرە سەلمان بکەم . ڕەنگە ئاسان نەبێت هەمووی بۆتان بگێڕمەوە وئێوە بڕوام پێ بکەن.

حوسین خوی خێزانەکەی برابوونە نوگرە سەلمان ، هەموو زوڵم وزۆر وتاوانەکانی جەلادەکانی نێو ئەو جەهەنمەی وەك خوی تۆمار کردووە . بۆیە بەهە ناسەیەکی ساردو ڕوخساریکی شێواوەوە درێژەی بە قسەکانی داو وتی( ئێمە کە براینە ئەوێ زیاتر لە ۳۰۰۰هەزار نەفەر دەبوین ، پێش ئێمەیش نزیکەی چۆارسەت سجنی هەڵە بجەیش لەوێ دەستبەسەربوون ، لە ماوەی ۸مانگ مانەوەماندا بە سەدان ژن ومناڵ وپیروپەککەوتە گیانیان لە دەست داو ومردن ،چ بە هۆی برسێتی ونەخۆشیەوە چ بە هۆی ئازارو ئەشکەنجەوە ،چونکە چەند جەلادیك هەبوون لەنیو سجنەکەدا کە مایەی بەشی هەرە زۆری مەینەتیەکانمان بوون، کە ئەوانیش بریتی بوون لە حەجاج وشەوقی ومورقەدەم حەسەن .

پاشان هەندیك لەو دیمەن ویادەوەرییانەی بۆمان گێڕایەوە ووتی (ئەو هەشت مانگە جەهەنممان بە چاوی خۆمان بینی . بۆ نمونەڕۆژانە بۆ ماوەی چارەکە سەعات دەریان دەکردینە نێو حەوشەی سجنەکەوە ، پاشان بە پەلە شاوریان لێدەدا ودەبۆایە کەس

دوانەکەوتایە وبە پەلە بچوونایەنە ژوورەوە ، ڕۆژێکیان لەو بەزمەدا ژنیکی بە تەمەن وبێ تاقەت دوا کەوتوو ونەیتوانی لە گەڵ عەشاماتەکەد بچێتە ژوورەوە، ئیتر حەجاج زۆر تووڕە بوو بڕیك بە کیبڵ لە ژنەکەی وئەو شەوە بە بێ نان وئاو لە ناو حەوشەکەدا گلیدایەوە ، کاتیك بەیانی ڕۆژ بووە ، تەماشامان کرد ژنەکە مردووە وئەمری خۆای کردووە . ژنەکە خەڵکی ناوچەی

داویٚ بوو. حەجاج ئەگەر ڕۆژی دوو سێیەکی کەسی نەکوشتایە دڵی ئارامی نەئەگرد ڕۆژێك کوڕیکی هەڵەبجەیی بە ناوی فەلاحی هەر بەکێبلٚ لە ناو حەوشەی سجنەکە دا بە بەر چاوی هەمووماناەوە کوشت ).

هەر کە هاتینە سەر باسی سەگە ڕەش ، حوسێن ئەوەندەی تر ڕوخساری شیوا

و ووتی( ڕۆژانە ئەوەی بە دەستی برسێتی ونەخۆشی وحەجاجەوە بمرایە، ئەوا دواتر دەبووە خۆراکی سەگە ڕەش، هەر کەسیك دەمرد بە جل وبەرەکەی خۆیەوە ب دوو سیٚ کەسیك دەمان بردە دەرەوەی سجنەکە ولە ژێر تۆزیك قومدا دەمان شاردەوە ،ئیتر سەگەکە وا ڕاهاتوبوو دوای ئێمە ئەچووە سەر جەنازەکە ،دوای ئەوەی لە ژیٚ قومەکە دەریدەهێنا دەستی دەکردە خۆاردنی ،بە بەر چاومانەوە قاچ ودەستی مردووە کانی دەخۆارد ،کە چی چارەش نەبوو .ڕۆژ وا هەبو ١٠تا ١٢دەسمان لیٚ دەمرد ودەبووە خۆراکی سەگە ڕەش٠٠٠٠٠).

العدد / ١٤٦٢
التاريخ / ١٩٨٧/٧/١

(( سري وعلى الفور ))

مديرية مخابرات محافظة التأميم
الى / مديرية مخابرات العامة

الموضوع / تنفيذ حكم الأعدام

اليكم قائمة بأسماء مجموعة من الأشخاص الذين تم اعتقالهم في عمليات الأنفال الثانية ولي منطقة ( نوجول ـ تاوس بور ) ونظرا لكبر سنهم وعدم الأستفادة منهم لغرض المعلومات فقد تم أعدامهم بعد أخذ التوجيهات اللازمة من لدن القيادة السياسية وتم التصرف بجثثهم ونأتيكم قائمة بأسماء كل منهم مع عمر كل واحد من المذكورين راجين التفضل بالاطلاع مع التقدير .

| الأسماء | العمر |
|---|---|
| داود جاسم محمد | ٥٦ |
| رشيد عبدالله توفيق | ٦١ |
| احمد فاتح رحيم | ٥٨ |
| شكر موسى عباس | ٥١ |
| عبدالله قرناز حسين | ٤٧ |
| حسن علي احمد | ٦٤ |
| ويس جبار ابراهيم | ٤٥ |
| علي سعد عبدالرحمن | ٣٣ |
| رشيد حاجي قادر شريف | ٤٩ |
| عبدالرحمن عبدالله عزيز | ٦٠ |
| محمود رشيد احمد | ٧٤ |
| قادر سعد محي الدين | ٥٧ |
| أحمد صالح عبدال | ٦٢ |

التوقيع
مديرية مخابرات محافظة التأميم
١٩٨٦/٧/١

ربيع

| الأسماء | المواليد |
|---|---|
| نوري امين علي | ١٩٥٢ |
| عبدالكريم علي فارس | ١٩٥٠ |
| هاشم عبدالله غفور | ١٩٦٨ |
| نجم محمد امين علي | ١٩٥٢ |
| عبدالرحمن محمد علي | ١٩٦٤ |
| برزان محمد عزالدين | ١٩٥٠ |
| عبيريه نصرالدين عزالدين | ١٩٦٤ |
| بهان كامل حبيب | ١٩٧١ |
| عثمان ولي عبدالقادر | ١٩٦٨ |
| هيرو عادل نصرالدين | ١٩٧١ |
| باكيزه حبيب عزالدين | ١٩٦٦ |

مدير مخابرات محافظة التأميم

١٩٩٠/١٠/١٢



حەسەن بارام
لەدایك بووی 1975 خورماتوو
خوێندکاری زانکۆ بەشی مێژوو

لە چاپکراوەکانی نووسەر:
- خورماتوو لە نێو پاکتاوی رەگەزیدا



لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوك

21